

ئەتهەم ئەمین نێموتلو

ئەم ڕۆمانە بە ئیلهام وەرگرتن لە
چیرۆکێکی ڕاستەقینەوە نووسراوە...

# نزا قەدەر دەگۆڕێت

وەرگێڕانی: نما خۆشناو

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf
بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

# نــــزا قەدەر دەگۆڕێت

نوسینی: ئەتهەم ئەمین نێموتلو

وەرگێڕانی: نما خۆشناو



ناوی کتێب: نزا قەدەر دەگۆڕێت
بابەت: ڕۆمان
نووسەر: ئەتهەم ئەمین نیموتلو
وەرگێر: نما خۆشناو
پێداچوونەوە: سیروان سلێمان
دیزاین: هەرێم عوسمان
قەبارەی کتێب: ١٣سم * ٢١سم
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ ز

لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٢٩٩) ی ساڵی ٢٠٢٣ ی پێدراوە






کتێبخانەی **گۆڵدن بووك**
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Golden book ktebfroshe_warzer
Warzer Book Ktebfroshe_warzer



## پێنجی دەوێت بۆ سەختییەکان...

کاتێک هاتمەوە ماڵەوە سەیرمکرد دایکم دەگری، تێنەگەیشتم کە چی بووە. ڕێک کاتێک ویستم بپرسم چی بووە، لە دەرگا درا. وەک ئەوە وابوو کە دەنگی زەنگەکە تیرێک لە ناوەڕاستی دڵم بدات، دڵمی پڕکرد لە دڵەڕاوکێ، چونکە خەمێک باڵی بەسەر ماڵەکەدا گرتبوو و ئەو خەمە خێرایی سوڕی خوێنمی زیاد دەکرد. نەمتوانی تەنانەت بە دایکیشم بڵێم؛ "چی بووە؟" و ناچاربووم بەرەو دەرگاکە ڕابکەم. کاتێک لە دووربینی دەرگاکەوە سەیرم کرد بینیم کاکە أحمد-ی دەرگاوانی بیناکە هاتووە. کە ئەوم بینی ویستم بگەڕێمەوە بۆلای دایکم پێش ئەوەی دەرگاکە بکەمەوە، بەڵام ئەو جارێکیتر لە زەنگەکەیدا، بۆیە گەڕامەوە و دەرگاکەم کردەوە.

کاکە أحمد کەسێکی نیگا سارد بوو، و هەستەکانی زۆر دەرنەدەخست و کەسێکی ڕاستگۆ بوو. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"چۆنیت ئاسلان؟"

لە ڕاستیدا ئەو ساتە هیچ باش نەبووم. بەدەم نزاکردن و شاردنەوەی دەنگی هەنسکی ناو ناخم گوتم؛ "باشم کاکە

أحمد، فەرموو. چی بووە، زۆر بەپەلەیە؟" کە وام گوت دەنگی لەرزۆکتربوو و گوتی:

"هاتوون تا کارەباتان ببڕن، من ڕێگریم لێ کردن. کارمەندەکان لە خوارەوە چاوەڕێی تۆ دەکەن."

نەمزانی چی بڵێم. هێشتا تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو، لە تەمەنێکدا نەبووم کە بەتەواوی ئەقڵم بە دنیا بشکێت. هەرچەندە بەهۆی ڕووداوەکانی ژیانمەوە کەمێک پێگەیشتووتر بووم لە هاوتەمەنەکانم، بەڵام هێشتا دەمارەکانی گەنجێتی ناو مێشکم چالاک بوون و ڕێگر بوون لەوەی بە باشی بیر بکەمەوە، بەڵام ئەو زانیارییانەی بە ئەزموون فێریان دەبین نە پەیوەندیان بە تەمەنەوە هەیە نە بە زانیارییەوە. هەرچەندە لە قوتابخانەی سەرەتاییدا واتای زانیاری ژیانم خوێندووە، بەڵام 'زانیاری ژیان' بە ئەزموون فێردەبیت نەک بە خوێندن؛ هەندێک کەس بە سەختی و هەندێک کەسیش بە ئاسانی فێری ئەم ئەزموونە دەبن. ئەو ساتە تێگەیشتم لەوەی من لەوانە دەبم کە بە سەختی فێری دەبن...

مادام باسی خۆمم کرد با ئەمانەش بڵێم؛ لە ڕاستیدا جیاوازبووم لە هاوتەمەنەکانم، قۆناغی ئامادەییم بە خێرایی تێپەڕی. ئارەزووی شەڕ و شۆڕم دەکرد و شێتۆکە بووم. دەزانم دەڵێیت؛ "کێ لە قۆناغی ئامادەییدا شێتۆکە نییە؟" بەڵام من کەمێک زیاتربووم. بنکەی پۆلیس، نەخۆشخانە، ئامبولانس، ئۆتۆمبێلی پۆلیس و هەموو شتێکم بینی و تامم کرد و پاشان هێمن بوومەوە.

ئەگەر بپرسن؛ "ئایا پەشیمانیت؟" دەڵێم نەخێر؛ چونکە بەڕای من زانیاری ژیان یەکێکە لە جوانترین زانیارییەکان و ئەویش بە ئەزموون بەدەستدەهێنرێت نەک بە خوێندن. منیش بە ئەزموون فێری بووم و پەشیمانیش نیم، بەڵام کەسایەتییەکم هەبوو کە هەرگیز خۆم بۆ نەدەگیرا و زۆر پەشیمانم لەمە. ئاستی ئارامگریم زۆر نزمبوو، دەبوو ئەمە چاک بکەم و ئارام بگرم، وە دەمزانی کە ژیان بە ئاسانی بێت یان سەختی هەر فێری ئەمەم دەکات.

با بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان دۆستم، هەرچۆنێک بێت جار جار باسی خۆمت هەر بۆ دەکەم...

پرسیم و گوتم؛ "کاکە أحمد، چی بکەین؟". چاوەکانم پڕ بوون و سەرڕێژیان کرد. لە کاتێکدا کە نەمدەزانی دایکم لە ژوورەوە بۆچی دەگریی، کارەبا و شتم هەر بە خەیاڵدا نەدەهات. کاکە أحمد دووبارە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"نازانم، وەرە با بچینە خوارەوە و قسەیان لەگەڵ بکەین." منیش گوتم؛ "کاکە تۆ بڕۆرە خوارەوە و منیش هەر ئێستا دێم." پاشان دەرگاکەم بە خێرایی داخست و بە فڕکانێک چوومەوە ژوورەوە، ڕامکرد بۆلای دایکم. دەمگوت؛ "دایە چیت لێ بەسەرهاتووە؟" بەڵام ئەو هەر دەگریا، نەیدەتوانی باسی هیچ بکات. جگە لە من کەسیتر لە ماڵەوە نەبوو. براکەم لە سەربازی بوو، خوشکەکەم هاوسەرگیری کردبوو، هەر من و دایکم و باوکم بووین...

هەر بەڕاست ئەوە باوکم لە کوێیە؟ باوکم هەمیشە لە ماڵەوەبوو، چونکە کاری نەدەکرد. لەبەر ئەوەی ماڵمان

گواستبووەوە بۆ شوێنێکی دوور، نەیدەتوانی بە ئاسانیش بچێت بۆ قاوەخانە کۆنەکەی. بێگومان نەیدەتوانی بڕوات، لەبەر ئەوەی هیچ کارێکی نەدەکرد و پارەش لە گیرفانیدا نەبوو. بۆیە چوار مانگە کرێی خانووەکەی نەداوە، پارەی کارەبا و گازی نەداوە و گازەکەیان بڕیوین... بەڵام هاوڕێ، من ئاگام لەمانە نەبوو، ئاگام لە هیچ شتێک نەبووە! دایکم تۆزێک هاتەوە سەرخۆی و گوتی؛ "باوکت ڕۆیشت کوڕم."

بەڕاستی لە هیچ تێنەگەیشتم، چونکە باوکم هەر بەردەوام دەڕۆیشت؛ کە منداڵیشبووم دەڕۆیشت، کە گەورەشبووم هەر دەڕۆیشت؛ بە گورتییەکەی هەمیشە دەڕۆیشت. من هەر دەمگوت؛ "دایە بۆ کوێ ڕۆیشت، بۆچی دەگریت؟" و ئەویشت دەیگوت؛ "ڕۆیشت". کاتێک گوتی؛ "چاکەتەکەی برد و ڕۆیشت." تێگەیشتم لە بابەتەکە...

باوکم ئێمەی بەجێهێشتبوو و ڕۆیشتبوو، بەڵام لە ئێستادا نەمدەتوانی تەنانەت بیریشی لێ بکەمەوە. کاتێک گوتم؛ "دایە کاکە أحمد لە خوارەوە لەگەڵ فەرمانبەرەکاندا چاوەڕێی منە تا کارەباکەمان نەبڕن، دەبێت بڕۆمە خوارەوە بۆلایان." دایکم گوتی؛ "کوڕم ئەم بەیانییە گازەکەشمانیان بڕی".

ئەها لە ماڵەکاندا ڕاڕەوێک هەیە کە لە ژووری نوستنەکانەوە دەچێت بەرەو دەرگاکە؛ دەمویست ڕێک لەوێدا بیبوورێمەوە، چونکە دەمزانی دەستەکانی من هێشتا زۆر بچووکن بۆ هەڵگرتنی ئەم دەردانە. هەرچەندە ئەزموونم هەبوو لەبارەی ژیان، ئازار یان

دەردەوە، بەڵام نەمدەزانی کە بەرپرسیاریتی بارێکی لەم شێوەیە چییە.

کاتێک بیرم لەوە دەکردەوە کە هێشتا تەمەنم بیست و دوو ساڵە و باری کارەبا، گاز، کرێ خانوو و خێزان هاتۆتە سەرشانم، بێ ئەوەی بەخۆم بزانم لە دەرگاکە چووبوومە دەرەوە و ڕۆیشتبوومە خوارەوە. کاکە أحمد قسەی لەگەڵ فەرمانبەرەکان کردبوو و داوای پێنج ڕۆژ مۆڵەتی لێ کردبوون و فەرمانبەرەکان دەمێکبوو ڕۆیشتبوون. کاکە أحمد جگەرەیەکی بۆ درێژ کردم. بە دەنگە لەرزۆکەکەیەوە و زەردەخەنەی دڵخۆشی یارمەتیدانی ئێمەوە گوتی: "وەرە وەرە شێرەکەم، چارەسەرم کرد، بەڵام تەنها بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ."

هەرچەندە کاکە أحمد و دراوسێکانمان باوکمیان خۆش نەدەویست، بەڵام ئێمەیان خۆشدەویست. گوتم "ئۆخەیش!" و جگەرەکەم داگیرساند، بەڵام کاکە أحمد دەستی بە قسەکردن کرد و پرسی: "ئاگاداریت کە ئەم بەیانییەش گازەکەتانیان بریوە؟" گوتم: "دایکم تازە پێی گوتم کاکە." گوتی: "نەمتوانی هیچ لەو بارەیەوە بکەم، چونکە لێرە نەبووم، کە هاتمەوە ژنەکەم پێی گوتم." منیش بە توڕەیی و یاخیبونێکی کەمەوە گوتم: "گوێی مەدەرێ کاکە".

بۆ ئەو خوێنەرەی ئێستا ئەم پەڕەیە دەخوێنێتەوە: تکایە لە خۆت بپرسە: "ئەگەر من لەو دۆخەدابوومایە چۆن وەڵامم دەدایەوە؟" منیش ڕێک بەو شێوەیە وەڵامم دایەوە...

کاکە أحمد بەردەوامبوو و گوتی؛ "سەیرکە کورم، ئەگەر شتێک هەیە کە بە ئێمە بکرێت ئەوا قسە بکە، ئەم دۆخە نابێت ئاوا بەردەوام بێت". لەسەر هەقبوو، چونکە هەفتەی پێشووش خاوەن ماڵەکە هاتە سەرمان و گوتی؛ "خانووەکەم چۆڵکەن ئیتر، ئەوە چوار مانگە کرێکەم نادەنێ".

پێشتر ئێمە نەماندەزانی کە کێشەیەکی لەو جۆرەمان هەیە لەگەڵ خاوەن ماڵەکەماندا؛ واتە تازە زانیبوومان چوار مانگە کرێمان نەداوە، واماندەزانی باوکم لە کاتی خۆیدا دەیدات، کە خاوەن ماڵەکە هاتە بەردەرگامان ئینجا بە دۆخەکەمان زانی. خوا لە خاوەن ماڵەکەمان ڕازیبێت، چوار مانگە لەسەرمان وەستاوە سەرەڕای ئەوەی هیچ کرێیەکمان نەدابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی باوکم چیتر وەڵامی پەیوەندییەکانی نەدەدایەوە ناچار بووبوو بە شەرمەوە بێتە بەر دەرگای ماڵمان. هەرچەندە پێشتر سەختی لەم جۆرەمان بینیبوو، بەڵام ئەمەیان جیاوازبوو، چونکە بۆ یەکەم جار خێزانەکەمان دابەشبووبوو. براکەم لە سەربازی بوو، خوشکەکەم تازە هاوسەرگیری کردبوو، تەنانەت هێشتا قەرزەکانی هاوسەرگیرییەکەیمان نەدابوەوە... باوکیشم ڕۆشتبوو؛ وە ئەم جارە بە جددی ڕۆیشتبوو، لەبەر ئەوەی هیچ ئاگای لە ماڵ نییە، دایکم چووبوو بۆلای پارێزەر، داوای جیابوونەوەی تۆمارکردبوو و ئاگادارییەکەشی نێردرابوو بۆ ماڵمان. باوکم هەر کە ئاگادارییەکەی بینیبوو چاکەتەکەی لەبەرکردبوو و ڕۆیشتبوو.

من هەر لە کۆنەوە لەگەڵ باکمدا ناگونجێم. وتەیەک هەیە کە

زۆر بەدڵمە و دەڵێ؛ "باشترین شت کە باوکێک بتوانێت بەرامبەر منداڵەکەی بیکات خۆشویستنی دایکی منداڵەکەیەتی." باوکم بە باشی مامەڵەی لەگەڵ دایکمدا نەدەکرد. مرۆڤەکان هەڵە دەکەن، بەندەی بێ هەڵە نییە، بەڵام هەڵەکانی باوکم زۆر زۆر بوون. هەرچەندە زۆربەی کات لێی تێنەدەگەیشتم، بەڵام لە زۆر ڕووەوە سەر ئەوم دابووەوە؛ کەسێکی توڕە، توند و بێ ئارام بووم. لەو ساڵانەدا ڕێک کۆپی باوکم بووم...

ژیانی باوکیشم هێندە ئاسان نەبووبوو، لە دەوڵەمەندییەوە کەوتبووە ناو هەژارییەوە. هەندێک کەس دەڵێن؛ "هەڵەی خۆیان بوو." هەندێکیش دەڵێن؛ "با کەمیان بخواردایە." هەندێک کەسیش دەڵێن؛ "قـەدەر"... من لەوانەم کە دەڵێن قـەدەرە. کاتێک مرۆڤ قـەدەری خۆی دەژی، ئەگەر هەڵەکانی ببنە هۆی گۆڕینی ئەو قەدەرە، ئەوا لە جیاتی ئەوەی لە قەدەری خۆی یاخی ببێت زیاتر ڕوو دەکاتە خودا.

مەولانا دەڵێت:

"بێچارەیی جوانترین نیشانەیە کە لە خوداوە دێت، پێت دەڵێت کاتی نزاکردنت هاتووە."

لەو کاتانەی بێچارە دەبیت؛ ئەها هەموو شتێکت بەسەردا کەڵەکە دەبێت، هەموو دەردەکان بەسەرتدا دەبارێن، ناتوانیت هەڵبێیت؛ نە چەترت پێیە و نەماڵێک هەیە پەنای بۆ ببەیت، تەڕ دەبیت لەژێر ئەو بارانی دەردەدا و بۆخۆت ئاوا دەمێنیتەوە، لە ژێر ئەو بارانەدا هێندە خۆت توند دەکەیت و خۆت گرژ دەکەیت

خەریکە دەخنکێیت... ڕێک لەو کاتەدا ئەگەر لە جیاتی یاخیبوون نزا بکەیت، بیر لەو کەسانە بکەیتەوە کە لە دۆخی خراپتردان، خۆت بەهێزتر دەکەیت و دەتوانیت بەسەر دەردەکانتدا زاڵ ببیت.

بەهەرحاڵ، ڕومکردەوە کاکە أحمد. گوتم: "کاکە هیچمان لەدەست نایەت، سوپاس بۆ خودا کە نەمردوین و دەژین، تەندرووستیمان باشە و دەست و قاچمان کاردەکات و دەتوانین کار بکەین." بەڵام بەو مووچەیەی لە شوێنی کارەکەمم وەردەگرت دەمتوانی کرێی خانوەکە بدەم، جگەرە بکڕم و بەشی پارەی ڕێگامی دەکرد، با بڵێین دەمتوانی پارە بۆ براکەشم بنێرم... لەو کاتەدا بەجۆرێک پارەی کارەبا و ئاو، کرێ کۆبووەوەکان، خەرجی ماڵ، خەرجی خواردن و قەرزەکانی دایکم و خوشکەکەم وەک فیلمێک هاتەوە پێش چاوم. خەڵکی کە دەیانگوت: "وەک ئەوە وابوو تەشتێک ئاوی کوڵهاتوو بڕێژن بەسەرمدا." باوەڕم پێ نەدەکردن. وەڵاهی هەتا نەیبینی نازانی، ڕێک وایە و ئەو ئاوە دەڕێژرێت بەسەرتدا، هەتا نینۆکەکانی پێت دەسوتێنێت؛ لەو ساتەدا ڕێک بەم شێوەیە هەستم دەکرد.

کاکە أحمد لە ناکاو گوتی: "چی بوو کوڕە، باشیت؟"

گوتم: "باشم باشم، کاکە دەبێت بڕۆمەوە ماڵەوە، دواتر قسە دەکەینەوە" و بەرەو ئاسانسۆرەکە ڕامکرد و بەخێرایی چوومەوە ماڵەوە. کە دایکمم بینی سەیرمکرد دووبارە چووەتەوە سووچەکەی خۆی و تەسبیحەکەی هەڵگرتووە و تەسبیحات دەکات. دایکم کەسێکی ئاوها بوو؛ هەرکاتێک بکەوتایەتە تەنگانەوە دەستی

دەکرد بە گریان و دوای گریانەکەی باوەشی بە تەسبیحەکەیدا دەکرد. دەیزانی کە هەموو شتێک لە خوداوە دێت و منیشی فێری ئەوە کردبوو. منداڵەکان یەکێک لە کەسەکانی خێزانەکەیان بە نموونە وەردەگرن و وەک ئەو دەژین. نموونەی منیش دایکم بوو. هەموو کاتێک دەمگوت: هەرگیز وەک باوکم نابم! نازانم کە دەبم یان نا، بەڵام هیچ کاتێک نامەوێت وەک ئەو بم... نەک لەبەر ئەوەی کەسێکی خراپە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە خراپی مامەڵەی لەگەڵ نمونەکەی مندا دەکرد، هەرگیز نەمدەویست وەک ئەو بم، چونکە دایکمی خەمبار دەکرد.

دایکم کە لە تەسبیحاتەکەی تەواوبوو بانگی کردم و گوتی؛ "کوڕم!" من لە چێشتخانەکەبووم و جگەرەم دەکێشا، بەپەلە دامنا و ڕامکرد بۆلای و گوتم؛ "فەرموو دایە گیان". بە دەنگێکی گریاوەوە گوتی؛ "باوکت کە ئاگادارییەکەی دادگای بینی ڕۆیشت، ئەگەر من باوکت بناسم ئەوا جارێکی دیکە نایەتەوە". بەڵێ باوکم ئاوها بوو؛ باوکم کەسێکی کەلەڕەق بوو، بەهۆی کەلەڕەقییەکەشییەوە نەدەهاتەوە. دایکم ڕاستی دەکرد.

گوتم؛ "هیچمان لەدەست نایەت دایە گیان. تۆ دەتەوێت جیاببیتەوە؟ ئەگەر دەتەوێت ئەوا من لەگەڵتم، بەیەکەوە کار دەکەین و هەموو شتێک چارەسەر دەکەین، تۆ خەمت نەبێت. من پارەی پسوڵەکانیش چارەسەر دەکەم." هەموو پسوڵەکانم هەڵگرت و نیشانی دایکمم دا و گوتم؛ "سەیربکە و بزانە چۆن چارەسەری دەکەم". هەتا دایکم گوتی؛ "بۆ کوێ کوڕم؟" من دەمێکبوو لە ماڵ دەرچوبووم...

سەرخۆش نەبووم، بەڵام تازە هاتبوومە دەرەوە، بەڕاستی منیش نازانم پشتم بە چی بەستبوو. کاتێک لە بیناکە چومە دەرەوە تێگەیشتم کە ناتوانم پارەی ئەو پسوڵانە بدەم، چونکە هێشتا دوازدە ڕۆژی ماوە بۆ وەرگرتنی مووچەم. ڕاستە ئەگەر مووچەشم وەربگرتایە بەشی چی دەکرد؟ یەکەم کێشەی گەورەمان، خاوەن ماڵەکەمان بوو. دووبارە چوومەوە بۆلای کاکە أحمد، لە دەرگاکەیانمدا. گوتم؛ "کاکە أحمد من ژمارەی تەلەفۆنی خاوەن ماڵەکەمانم لەلا نییە، دەتوانیت پێم بدەیت؟" ژمارەکەم وەرگرت و پەیوەندیم پێوە کرد. ئەمانە کۆتا پەیوەندی تەلەفۆنیم بوون بە تەلەفۆنە جوانە خۆشەویستەکەم. خاوەن ماڵەکە وەڵامی دایەوە. گوتی؛ "سلام علیکم". گوتم؛ "علیک سلام، کاکە. من ئاسلان-م چۆنیت؟" ڕاستەوخۆ ناسیمییەوە و پرسی "هیچی خراپ نەبووە؟" ئەمە زۆر هەست بزوێنبوو. ئێمە قەرزاری ئەو پیاوە بووین بەڵام کە من پەیوەندیم پێوە کرد هەستی کرد کێشەیەک هەیە و ڕاستەوخۆ پرسیاری باشی ئێمەی کرد لەجیاتی قەرزەکەی. با بڵێم خودا خاوەن ماڵی لەو شێوەیە بکات بە نسیبی هەموو کەسێک و بەردەوام بم...

کەمێک باسی کێشەکانم بۆ کرد؛ گوتم کە کەمێک کێشەی داراییمان هەیە و خوشکەکەم تازە هاوسەرگیری کردووە، براکەم لە سەربازییە و باوکم ڕۆیشتووە... هیچی نەگوت. بەڵێنم پێدا و گوتم؛ " پارەی دوو کرێت بۆ دەهێنم، بەڵام زۆرمان لێ مەکە و ماوەیەک یارمەتیمان بدە. هەرگیز پارەت لەلای ئێمە نامێنێتەوە".

ئەویش پەسەندی کرد. گوتی؛ "تەنها خودا لێی ناقەومێ، شتی وا هەر دەبێت، خەم مەخۆ." و کەمێک ئامۆژگاری کردم، بەڵام لەو کاتەدا مێشکم نە ئامۆژگاری وەردەگرت نە هیچ شتێکی دیکە. تەنانەت نەمدەتوانی سەریشم بەرز بکەمەوە، وەک ئەوەی لە ئاسمان زویر بوو‌بێتم.

باشە ئاسڵان پارەی دوو کرێی لە کوێ دەهێنا؟ ئاها گوتم ئەمانە کۆتا پەیوەندییەکانم بوون بەم تەلەفۆنە... بێگومان ئەو تەلەفۆنە جوانە بە بەهایەی دەفرۆشت کە هێشتا قیستەکانیشی تەواو نەبووبوون.

لە خوار بیناکەمانەوە دوکانێک هەبوو هەمیشە دەچووم بۆی، خاوەنەکەی هاوڕێم بوو. کەسێکی باشبوو، بەڵام بیرکردنەوەمان جیاوازبوو، بۆیە هەرچەندە یەکتریمان خۆشدەویست، بەڵام زۆر بەیەکەوە ڕێکنەدەکەوتین.

خۆتان بێبەش مەکەن لە نزا،
بزانە کە قەدەرت لە ناو دەستەکانتدایە.
دەستەکانت بەرەو ئاسمان بەرزبکەرەوە و
دەست بکە بە نزاکردن...
لەبیری مەکە، ئەگەر خودا ئارەزووی لێ بێت
هەموو شتێک لە ساتێکدا دەگۆڕێت...



پسوڵەکان بە دەستمەوە بوون و بیرم لە کرێکە دەکردەوە، کاتێک خۆم کرد بە دوکانەکەدا. ڕاستەوخۆ گوتم: "هاوڕێ، دەبێت تەلەفۆنەکەم بفرۆشم". پرسی: "کوڕە چی بووە بێ سەلام و کەلام؟" گوتم: "وازی لێ بێنە، دەبێت بەپەلە تەلەفۆنەکەم بفرۆشم، بە ڕای تۆ چەند دەکات؟" لەم کەین و بەینەدا ئەو تەلەفۆنەکەی لێ کڕیم، خۆی هەر لە لاوە چاوی لەسەری بوو. قەرزاری پارەی سەمون و جگەرەی دوکانەکەش بووم و کە گوتی: "با ئەوانەی لێ کەم بکەینەوە." نەمتوانی بڵێم: "نابێت".

پارەکەم هەڵگرت و بەردەوامبووم لە دانیشتن لەوێ، پارەکەم تەنها بەشی دوو کرێی دەکرد و بە خاوەن ماڵەکەشم گوتبوو کە پارەی دوو کرێی دەدەمێ، بەڵام دەشبوو پارەی پسوڵەکان بدەم، دەبوو تەلەفۆنێکیش بکڕم بۆ پەیوەندیکردن بە خەڵکەوە... کاتێک دەڵێم بۆ پەیوەندیکردن مەبەستم بۆ کاری ناپێویست نییە، تەلەفۆن مەرجبوو بۆ دۆزینەوەی پارە، چونکە لە سەردەمی تەکنەلۆجیادا دەژین، ناکرێت نامە بۆ خەڵک بنووسم، بۆیە دەبوو تەلەفۆنێک بکڕم. ڕاستەوخۆ گوتم: "براکەم بۆ ماوەیەک تەلەفۆنە کۆنەکەی خۆتم دەدەیتێ، تا خۆم تەلەفۆنێک دەکڕم؟" ئەویش گوتی: "باشە" و هەر لەوێ تەلەفۆنەکەی دامێ. بۆ ماوەیەکی کەم کڕینی تەلەفۆنم لە کۆڵبووبووەوە. سیمکارتەکەم تێکرد و هەر کە تەلەفۆنەکەم داگیرساند براکەم لە سەربازییەوە تەلەفۆنی کرد...

نەمتوانی بڵێم؛ "ئاه براکەم ئاه، ڕێک لە کاتی خۆیدا پەیوەندیت کرد. لە سەربازیت بەڵام زۆر پێویستم پێتە. وەرە بۆلام برا شێرەکەم، ئەی دەستم، قۆڵم، قاچم..." کەسایەتییەکەم بەوجۆرەبوو کە نەمدەتوانی زۆر هەستی خۆم بۆ براکەم دەرببڕم. ئەوم زۆر خۆشدەویست، بەڵام نەمدەزانی چۆن ئەو خۆشەویستییەی بۆ دەربڕم، بۆیە هەمیشە مەودایەک لە نێوانماندا هەبوو. بەڵام ئەو هەرگیز قسوری نەکردووە لە ڕێزدا؛ برا شێرەکەی خۆم...

وەڵامی پەیوەندییەکەم دایەوە، بێگومان نەمهێشت هەست بە هیچ بکات. کاتێک پرسیم؛ "چۆنیت، باشیت؟ هیچ کەموکورتییەکت نییە؟" گریان لە قورگمدا وەستا، چونکە بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر بیگوتایە "کاکە پارەی جگەرەشم پێ نەماوە." چیم دەکرد، پرسیارم لێکرد و ئەو وەڵامەم وەرگرت. گوتی؛ "کاکە دەتوانیت کەمێک پارەم بۆ بنێریت؟" گوتم؛ "باشە چارەسەری دەکەم." لەو کاتەدا داڕوخام؛ نەمتوانی بڵێم پێم نییە! کەوتبوومە دۆخێکەوە کە هێشتا خۆشم بە تەواوی درکم پێ نەکردبوو، لە تەمەنی بیست و دووساڵیدا ڕێک بووبوومە سەرۆکی خێزان. هێشتا لە دوکانەکە دانیشتبووم و نەمدەزانی چی بکەم. لەو نێوەندەدا هاوڕێکەم قاوەی بۆ تێکردم، بەدەم قاوە خواردنەوە هێندە ووردبووبوومەوە لە پسوڵەکانی دەستم هەر ئاگام لێنەبوو کە هاوڕێکەم بانگم دەکات.

لەو کاتەدا لە دڵی خۆمدا گوتم؛ "خودایە هێندە پارەم پێبدە کە هەرگیز بیر لەم پسوڵانە نەکەمەوە." کاتێک بیرم لەمانە دەکردەوە بە دەنگێک ڕاچڵەکیم کە دەیگوت؛ "ئاسڵان، ئاسڵان، ئاسڵان!" وەک

ئەوە وابوو تازە لە خەو هەستابێتم. گوتم: "چی بووە کورە؟" ئەویش هەمان پرسیاری لێکردم و گوتی: "ئەسڵەن تۆ چیتە؟ پێنج خولەکە بانگت دەکەم و هەر وەڵامیشم نادەیتەوە. دە بڵێ دەردت چییە؟" گوتم: "دوایی بۆت باس دەکەم، جاری ماڵئاوا." و ڕۆیشتمە دەرەوە. خۆ کەسیش نەیدەگوت: "ئاسلان بۆ کوێ دەڕۆی؟" هیچ شوێنێکم نەبوو بۆی بڕۆم، تەنانەت یەک شوێنیش نە دەهات بە مێشکمدا، بەڵام دەبوو بەپەلە پەیوەندی بە خاوەن ماڵەکەوە بکەم. پەیوەندیم پێوە کرد و وەڵامی دایەوە، گوتم: "کاکە پارەی دوو کرێکە ئامادەیە. لە کوێیت با بێم و بتدەمێ". گوتی: "نا نا، پێویست ناکات بێیت، من ژمارەی هەژمارێکت بە نامە بۆ دەنێرم و تۆش بیخەرە سەر ئەو هەژمارە." منیش گوتم: "باشە".

نامەکە هات و بەرەو بانک ڕۆیشتم. هەوڵم دەدا پارەکە بخەمە سەر هەژمارەکە، کاتێک ئەو بڕە پارەیەم بینی کە بانک داوای دەکات بۆ ئەنجامدانی مامەڵەکە، پەشیمان بوومەوە، چونکە پارەی ڕۆیشتن و هاتن کەمتری دەکرد لەو بڕە؛ نزیکەی نیوەی دەکرد، بۆیە دووبارە پەیوەندیم بە خاوەن ماڵەکەوە کردەوە. لەو کاتەدا هێندە بە ووردی هەژمارم دەکرد کە هەستم کرد تەنانەت گرنگی بە پارەی یەک سەمونیش دەدەم.

گوتم: "با من بێم بۆلاتان و پێتان بدەم." داوای ناونیشانەکەم کرد و بەڕێ کەوتم. چووم و پارەکەمدایە. کە پارەکەم پێدا گوتی: "چۆن لەو ماوە کەمەدا ئەم پارەیەت ئامادە کرد؟ دڵنیام کە باوکت پێی نەداویت". نەمتوانی بڵێم تەلەفۆنەکەم فرۆشتووە، نەوەک بە

هەڵە تێبگات، گوتم؛ "کەمێک پارەی کۆکراوەم هەبوو." بەڵام دیاربوو تێگەیشتووە لە دۆخەکە و گوتی؛ "با شتێک بکەین.. با من پارەی یەک کرێت لێ وەربگرم، لە ئێستادا من پێویستم بە پارە نییە. ئەمەش بە کرێی ئەم مانگە دادەنێم، کە باری دارایت باشبوو کرێی چوار مانگم بدەرێ." گوتم؛ "نەخێر". بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نەمدەویست وابڵێم. خاوەن ماڵەکە گوتی؛ "من برا گەورەی تۆم و دەمەوێت ئاوابێت." و پارەی کرێیەکی پێدامەوە.

کاتێک لەوێ چوومە دەر، هەستم دەکرد مێشکم ئاسوودە بووبوو، لە دڵی خۆمدا گوتم؛ "زۆر سوپاس بۆ خودا"، زۆر سوپاس... کاتێک بەرەو وێستگەی پاسەکە دەڕۆیشتم بە خۆمم گوت؛ "خودا هیچ بارێک ناخاتە سەر شانی کەسێک کە پێی هەڵنەگیرێت ئاسلان. تۆ دەتوانیت ئەم بارە هەڵبگریت، تۆ بەهێزیت، خودا تۆی خستۆتە ئەم دۆخەوە چونکە دەزانێت دەتوانیت هەڵیبگریت. قابیلە تۆ لە خودا باشتر بزانیت؟ بەدەم ئەم ورتە ورتەمەوە بەشی چیرۆکێک هات بە مێشکمدا...

حەزرەتی مەولانا ڕۆژێک دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە، کوڕەکەی بە خەمباری دەبینێت و پرسیاری هۆکارەکەی دەکات. کوڕەکەی لە وەڵامدا دەڵێت؛ "هیچ نییە". حەزرەتی مەولانا دەچێتە دەرەوە. پێستەی گورگێک بە دەرگاکەیانەوە هەڵواسراوە، ئەوە هەڵدەگرێت و لەبەری دەکات، دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەست دەکات بە لوراندن. کوڕەکەی کە ئەم دۆخەی باوکی دەبینێت پێدەکەنێت و قاقا لێدەدات. حەزرەتی مەولانا-ش دەڵێت؛ "ئاها کوڕم، بینیت؟

خەمی دنیاش ئاوایە. پێستەی گورگ لە ڕاستیدا ترسناکە، بەڵام تۆ نەترسایت، چونکە دەتزانی باوکت لە ژێر ئەو پێستەیەدایە و پێکەنیت. بۆیە بزانە کە خودا لە پشت دەردەکانەوەیە و متمانە بەو بکە!"

پێش ئەوەی سەر پاسەکە بکەوم دەبوو بچم پارە بۆ براکەم بنێرم، بە ڕاکردن بەرەو بانکەکە ڕۆیشتم و پارەم بۆ براکەم نارد، بەڵام ئەو پارەیە بەشی هەفتەیەکی دەکرد و نەدەکرد. لەبەر ئەوە نییە کە ئەو زۆر دەخوات یان زۆر پارە خەرج دەکات، ئەو پارەیە لە سەربازیدا هەر بەشی ئەوەندە دەکات.

بەهەرحاڵ... گەڕامەوە بۆ دەوروبەری ماڵمان، بەڵام هێندە مێشکم پڕبوو ناتوانم بۆت باس بکەم. باوەڕدەکەیت هەر بیرم نایەت لە پاسەکەدا بیرم لە چی دەکـردەوە. کەمێک ئاسوودە بووبووم، چونکە کاری خاوەن ماڵ و براکەمم چارەسەر کردبوو. ئێستا نـۆرەی پسوڵەکان بـوو. گـازی سروشیان بڕیبووین، خەریکبوو کارەباکەمانیان دەبڕی، باوەڕبکە هەر نازانم پسوڵەی ئاوەکە لە چ دۆخێکدابوو... دەزانم ئێستا دەڵێن؛ ئەری هیچ خزمێک هیچ هاوڕێیەکتان نییە؟ ڕاستە، ڕاستدەکەن بـەڵام بیرێکی لێ بکەنەوە و پاشان بڕیار بدەن بزانن کێ لە دەوروبەرمان هەیە...

خزمەکانی باوکم هەمیشە لێمان دوور بوون، هەرگیز لەگەڵمان نەبوون. بەڕای ئێوە نەیانبیستبوو کە باوکم ڕۆیشتووە؟ بێگومان بیستبوویان، بەڵام ئەی کێ تەلەفۆنێکی بۆ کردین؟ هیچکەس. بێگومان نازانم ئەگەر تەلەفۆنیان بۆ دایکم کردبێت یان نا، کە

ڕۆیشتمەوە لێی دەپرسم، بەڵام دڵنیام تەلەفۆنیان نەکردووە. خزمەکانی دایکیشم کاتی خۆی زۆر یارمەتییان داوین، بەڵام لە ئێستادا کەسیان لە دۆخێکی دارایی وادا نەبوون بتوانن یارمەتیمان بدەن، هەموویان هەر لە هەمان دۆخی ئێمەدابوون و کەسی نەیدەتوانی یارمەتیمان بدەن.

ئەگەر بێینە سەر هاوڕێکانیشم... دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویستم هەبوو، کە دەمتوانی پەیوەندیان پێوە بکەم؛ ئەوانی حوسێن و سەرهات بوون، بەڵام باوکی حوسێن هەفتەی پێشوو کۆچی دوایی کردبوو، بۆیە نەمدەتوانی بۆ شتێکی لەو جۆرە پەیوەندی بەوەوە بکەم، خۆی هەر دۆخی خۆشیان باش نەبوو و باوکی قەرزی بۆ بەجێهێشتبوون؛ لەبەر ئەوەی حوسێن تاقانە بوو ناچاربوو چاودێری دایکیشی بکات... دەبوو ئێستا لەلای ئەو بوومایە، بەڵام لەم کاتەدا نەمدەتوانی. منیش لە کاتێکدا خۆم بە مردوو دەزانی دەردەکانی ئەوم لەیاد کردوو. ئەم کارە هەڵەبوو، بەڵام تاکە شت کە لە دەستم دەهات و دەمتوانی بیکەم ئەوەبوو ڕۆژانە پەیوەندی پێوە بکەم و بڵێم؛ "هیچ هەیە بتوانم بۆتی بکەم؟ پێویستت بە هیچ نییە؟" حوسێن-یش دەیزانی کە دەمەوێت لەلای بم؛ ئەو هەموو شتێکی منی دەزانی و دەیزانی نیەتێکی خراپم نییە...

هاوڕێکەی ترم، کاکە سەرهات-م تازە هاوسەرگیری کردبوو، تەنانەت ئەو هەفتەیەی هاوسەرگیری دەکرد و ئاهەنگەکەی دەکرا لە کار دەریانکرد. چیم پێ بگوتایە؟ خۆشی ئیش و کاری

نەبوو. ئاگاداریش بووم کە هاوسەرگیری کردبوو؛ بە قەرز و قۆڵە هاوسەرگیری کردبوو. باوەڕ ناکەم ئەو دیاریانەی لە ئاهەنگەکەشدا بۆیا چووە، بەسبێت بۆ دانەوەی قەرزەکانی. تەنانەت نەمتوانی بچم بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری نزیکترین هاوڕێم. هێندە چاکەی لەگەڵ کردووم، لە ڕوم نەهات بچم، چونکە نەمدەتوانی هیچ دیارییەکیان بۆ ببەم. دەزانم هەرگیز بیر لەو شتانە ناکاتەوە، بەڵام من پێم قبوڵ نەکرا، چونکە تەنانەت پوتەکانی پێشم ئەو بۆمی کڕیبوو، لەبەر ئەوەی ۳ ساڵبوو هیچ پێڵاوێکم نەکڕبوو و پوتەکانم کۆن بووبوو و قاچم تەڕ دەبوو ئەویش لەگەڵ هاوڕێی کارەکانی پارەی کۆکردەوە و پوتێکی نوێی بۆ کڕیم، هەرگیز ئەم چاکەیەی لەبیر ناکەم. چەندین چاکەی تریشی لەگەڵ کردووم، بەڵام ئەمە لە هەمووی زیاتر هەستمی جوڵاند. زۆرم پێناخۆشبوو کە نەمتوانی دیارییەکی بچوکیشی بۆ ببەم لە ئاهەنگەکەیدا. واتە بە کورتییەکەی؛ نەمدەتوانی پەیوەندی بە کەسەوە بکەم. چاوەڕێبووم کەسێک پەیوەندیم پێوە بکات پرسیاری حاڵم بکات، بەڵام تەنها چاوەڕێم دەکرد...

تەنانەت بۆ ڕاوێژیش نەمدەتوانی پەیوەندی بە کەسەوە بکەم؛ دۆخێکی هێندە خراپ و ئاڵۆزبوو مێشکم دەرەقەتی نەدەهات. چوومەوە بۆ ماڵەوە، هەستم بە شانازی دەکرد، چونکە هەواڵی خۆشم پێبوو بۆ دایکم. چوومە ژوورەوە و بەپەلە ڕامکرد بۆلای دایکم. گوتم: "دایە پارەی کرێکەم چارەسەرکرد، پارەم بۆ براکەشم نارد..."

بەڵام دایکم زەردەخەنەیەکیشی نەکرد. تێنەگەیشتم بۆ، گوتم؛ "دایە، گوێت لێم نییە؟" دایکم گوتی؛ "کوڕم، ئاویش تەواو بووە". ئاو بە پسوڵە نەبوو، بە کارت بوو. ئاویش تەواوبووبوو. کاتێک کارتەکەمان دەخستە پشتی ئامێرەکەوە کەمێ ئاو دەهات، بەڵام باڵانسی ئەوەش تەواوبووبوو...

گوتم؛ "خەم مەخۆ، پارەمان پێیە". کۆتا پارەی گیرفانمم دەرهێنا و پێمدا و گوتم؛ "دە ڕۆژی تر موچە وەردەگرم، خەمت نەبێ". گوتی؛ "کوڕم نەکەی خەم بخۆیت. تۆ دەناسم دەزانم ئەمانەت پی ناخۆشە، بەڵام هەندێک کات مرۆڤ دەکەوێتە دۆخی ئاواشەوە، کارکردن و هەوڵدان هیچ کاتیک شتێکی خراپ و ئابڕووبەر نییە".

بە باشی لێی تێنەگەیشتم، بەڵام لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی؛ "لە بەیانییەوە دەست دەکەم بە پاککردنەوەی ماڵان. هاوڕێیەکم هەبوو، پەیوەندیم پێوە کرد و پێم گوت". دەکرێت ئێستا بڵێیت؛ "قەیچێکە، بە ناموسی خۆیەوە کار دەکات." تەنانەت لەوانەیە هەنێدکتان ئەو کارە بکەن، هەرگیز ئەم کارە بە کەم نازانم، بەڵام مرۆڤ کاتێک دەبیستێت دایکی ئەو کارە دەکات پێی ناخۆش دەبێت و منیش پێم ناخۆشبوو. دووبـارە دەیڵێمەوە، لەبەر ئەوە نەبوو کە ئەم کارەم بە کەم دەزانی، بەڵام ئەو دایکم بوو دایکم... دەچوو بۆ پاککردنەوەی تەوالێتی خەڵکی و منیش هیچم لەدەست نەدەهات، هەر هیچ هیچ! لە وەڵامدا گوتم؛ "من دەچم بۆ ژوورەکەم." و ڕۆیشتم. تەنها ئەو سەرینەی سەر جێگاکەم و خودا دەزانن چەند گریاوم... گریان عەیبە؟ بێگومان نەخێر، بەڵام

پیاو ناتوانێت بە ئاسانی لەبەردەم خەڵکدا و لە هەموو شوێنێک بگری. پیاو وا دەزانێت گریان نیشانەی لاوازییە، بەڵام کە زۆری بۆ هات و کاتی خۆی هات بە تەنها بەبێ دەنگی دەگری بەسەر سەرینێکدا، دیوارێکدا یان سوچێکدا...

## هەرچەندە دڵیشت بشکێت،
## لەبیری مەکە، خودا لە ناو دڵە شکاوەکاندایە...

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک، دووبارە هەستامەوە سەر پێ، دووبارە دەستمکردەوە بە هاندانی خۆم، گوتم؛ "دەی ئاسلان، دەی شێرەکەم..."، لە مێشکی خۆمدا پلانێکم دانا و چوومە دەرەوە لە ژوورەکەم. بە دایکمم گوت؛ "دایە، هەرگیز نابێت بچیت بۆ پاککردنەوەی ماڵان، من هەموو شتێک چارەسەر دەکەم. کەمێک کاتم بدەرێ. ئەگەر سەرکەوتوو نەبووم ئەوا ئەو کاتە برۆ". دایکم زانی زۆر خەمباربووم گوتی؛ "باشە".

بەڵام دوای ئەوەی من چووم بۆ سەر کار دایکیشم چووبوو بۆ پاککردنەوەی ماڵان، بێگومان من دواتر ئەمەم بیستەوە. هەموو جارێکیش دەیگوت؛ "کورم دەچم بۆ ماڵی پورت." یان "دەچم بۆ ماڵی دراوسێکەمان." تا من خەم نەخۆم. کارتی ئاوەکەم لە دایکم وەرگرت، پسوڵەی کارەبا و گازیش هەر بە خۆم بوو. دنیا تاریک بووبوو و ئاو و نان لە ماڵەکەدا نەبوو. چووم بۆ دوکانەکە و دەبەیەکی پێنج لیتری ئاو و سەمونم کڕی. لەگەڵ دایکمدا نانمان خوارد و پاشان هەر یەکەمان چووینە ژوورێکەوە. دایکم گوتی؛ "کورم من نزا دەکەم، تۆ بۆ خۆت بنو". هەرچەندە

لە جێگاکەمدابووم، بەڵام خەوم لێ نەدەکەوت. وابزانم نزیکی کاتژمێر ٢ی شەو بوو کە خەوم لێکەوت.

بەیانی کاتژمێر ١٠ چووم بۆ سەر کار، بەڵام پێش ئەوەی بگەم لە پاسەکەدا لە شۆفێرەکەم پرسی؛ "ئەم پاسانە بە زۆری لە کوێ دەشۆردرێن؟" چونکە دەمزانی ئێواران ئەم پاسانە دەشۆرێن، شۆفێرەکەش ناونیشانەکەی پێگوتم. شوێنێک بوو بەرامبەر ئەو مۆڵە بوو کە کارم لێ دەکرد، واتە نزیکبوو لە شوێنی کارەکەمەوە. لە پشووی نیوەڕۆدا بەپەلە بەرەو ئەوێ ڕۆیشتم. بە پێ پازدە خولەکم پێچوو تا گەیشتمە ئەوێ. ڕۆیشتم و قسەم لەگەڵ کردن. گوتم؛ "ئێواران دەتوانم بێم و پاس بشۆم". هەفتەی ٣ ڕۆژ کاتژمێر ١٠ دەچووم بۆ سەر کار و کاتژمێر ٦ تەواو دەبووم، ڕێککەوتین کە ئەو ڕۆژانە دوای کار بڕۆم و پاس بشۆم. دەبوو پارەی زیاتر ببەمەوە بۆماڵەوە.

بۆ نمونە ئەو ڕۆژە کاتژمێر ٦ لە کار تەواو دەبووم و تا کاتژمێر ١٠ پاسم دەشت، بەڵام لە دوای کاتژمێر ١٠وە کاری زۆر هەبوو، پاسەکان بە زۆری ئەو کاتە دەهاتن، لە کاتژمێر ٦ەوە تا ١٠ چەند پاسێکی زۆر کەم دەهاتن و ئەو پارەیەی دەستم دەکەوت تەنها بەشی خەرجییەکانی نان و ئاومانی دەکرد، یان بەشی پارەی جگەرەی برا سەربازەکەمی دەکرد، بەڵام هەر بڕیارمدا بڕۆم. لە شوێنی کارەکەشم هێندە دەموچاوم دابوو بەیەکدا هەموو کەسێک دەیپرسی؛ "چیتە؟" بەڵام نەمدەویست بۆ کەسی باس بکەم، چونکە هەرچەندە منیان دەناسی بەڵام ژیانیان، یان دیدگایان بۆ ژیان

بە جۆرێک نەبوو کە بتوانن لە من تێبگەن. پێم وانەبوو بتوانن یارمەتیم بدەن، بەڵام بیرۆکەیەک بە میشکمدا هات: ئەو دیارییانە وەربگرم کە بۆ بەڕێوەبەر دێن و بیانفرۆشمەوە...

قسەم لەگەڵ ئەو یاریدەدەری بەڕێوەبەرانە کرد کە منیان خۆشدەویست و متمانەیان پێدەکردم و ڕازیم کردن. ئەو دیارییانەی بۆیان دەهات من دەمکڕییەوە و لە شوێنی دیکە دەمفرۆشتەوە و قازانجم دەخستە سەر. یەکسەر لەگەڵ دوکاندارێکیشدا ڕێککەوتم. ئێواران دیارییەکانم دەکڕی و بەیانی ڕۆژی دواتر دەمبرد بۆ دوکانێک و دەمفرۆشت.

کاتژمێر ٦ لە کار تەواوبووم و بەرەو شوێنی پاس شتنەکە کەوتمە ڕێ، لە ڕێگا دیسان بیرم دەکردەوە و لەبەر خۆمەوە دەمگوت؛ "چی بکەم؟" ئەو بیرۆکانەی لەو کاتەدا دەهاتن بە مێشکمدا بیرۆکەی خراپ بوون، بەڵام من هەرگیز نەمدەتوانی خراپەکاری بکەم. بیرۆکەکانم و ناخمم بە پاکی هێشتەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە نابێت بێ ئومێد ببم لە خودا، سوپاسی خودام دەکرد کە تەندروستیمان باشە، وە دایکم فێری کردبووم؛ ئەگەر خراپەکاری و کینە میوەیەک بوایە لە بازاڕ ئەوا کەس نەیدەکڕی. بۆیە نابێت بە نییەتی خراپ و کینەوە هەڵسوکەوت بکەین.

دەمزانی چۆن ڕۆژە خۆشەکان تـەواو دەبـن ئـاواش ڕۆژە ناخۆشەکان هەر تەواو دەبن. لە ڕاستیدا هیچ ئامادە نەبووم بۆ ئەم دۆخە، چونکە کەسێکی شێتۆکە بووم، گرنگیم بە کچ دەدا، ژیانێکی بەتاڵم هەبوو، وە توشی کێشە بووبووم بەهۆی ئەم

گۆرانە خێرایەوە لە بەتاڵییەوە بۆ پڕی، بەڵام خودا هیچ بارێک ناخاتە سەر شانی کەسێک کە نەتوانێت هەڵیبگرێت... هەرچەندە لە سەرەتادا ئارەزووی ئەم بارەم نەدەکرد، بەڵام هەرگیز ناڕازی نەبووم، نەمگوت؛ "بۆچی؟" چونکە دەمگوت؛ "من بەهێزم بۆیە خودا ئەم بارەی خستۆتە سەر شانم، ئەگەر بیدایە بە خوشکەکەم یان براکەم نەیاندەتوانی هەڵیبگرن." شانازیم بە گەورەیی دەردەکەمەوە دەکرد. گوتم؛ "خودا منی هەڵبژاردووە". دەبوو بەڕاستی، بە سەلامەتی و بێ هەڵە ئەم تاقیکردنەوەیە تێپەڕێنم.

هاوڕێیان ئەمە تاقیکردنەوەیەکە کە ناو و نازناوت لەسەری نوسراوە، بابەتەکەی نووسراوە، نوسراوە کە دەبێت چیش بکەیت، بەڵام تۆ ناتوانیت بیبینیت، بەپێی سیناریۆیەک هەڵسوکەوت دەکەیت و تەنها ئەگەر بە ڕاستی هەڵسوکەوت بکەیت دەیبەیتەوە. تەنها کە لە ڕاستی لانادەیت دەتوانیت بیبەیتەوە، چونکە ڕۆژی سەخت بە ئاسانی مرۆڤ دەخاتە تەڵەی خۆیەوە. ئەگەر لەسەر ڕێی ڕاست بمێنیتەوە ئەوا دەتوانیت تەنانەت گوێت لە بێدەنگی قەلەڕەشەکانیش بێت. هەرچییەک ببێت دەبێت مرۆڤ لە ناخی خۆیدا هەر ڕێی ڕاست هەڵبژێرێت، چونکە لەو ساتەشدا کە وادەزانیت خۆرت ئاوابووە، دەتوانیت لە سوچێکەوە دەست بە ژیانەوە بگریت و بەردەوامبیت.

بێگومان دەڵێن ژیان سەختە، بەڵام نابێت لەبیری بکەین کە: دەبێت سەخت بێت تا ببێتە تاقیکردنەوە بۆمان، وانییە؟

چوبووم بۆ پاس شتن، ڕاستەوخۆ بەدلەیەکم لەبەرکرد و جزمەیەکم لەپێکرد و دەستمکرد بە شتن. لەبەر ئەوەی پێشتر لە شوشتنگەی ئۆتۆمبێل کارم کردبوو، دەمزانی چۆن ئامێری ئاوەکە بگرم و بەکاری بهێنم و شتنی پاس زۆر ئاسانتربوو لە شتنی ئۆتۆمبێلی ئاسایی. بۆ هەر پاسێک کرێیەکی دیاریکراوم وەردەگرت، دەبوو هەتا کاتژمێر ١٠ پاسی زۆر بشۆم، بۆیە بە خێرایی دەجولامەوە. کەسەکانی ئەوێش سەریان سوڕمابوو، چونکە وەک مێرووله کارم دەکرد. لەوانەیە بپرسن بۆچی تا کاتژمێر ١٠؟ چونکە دایکم وایدەزانی کاتژمێر ١٠ لە کار تەواو دەبم و دڵم نەهات پێی بڵێم دەچم بۆ پاس شتن تا خەم نەخوات.

هەر کە دەشبوو بە کاتژمێر نۆ و نیو هێز لە جەستەمدا نەدەما؛ هەرچەندە پێشتریش هەر کارم دەکرد، بەڵام کاری پاس شتن پێویستی بە هێز هەبوو، و منیش هێشتا نوێبووم لەو کارەدا، بۆیە هەموو گیانم تەشەنوجی کردبوو. شەو یان لە ئازاردا خەوم لێنەدەکەوت یان وەک منداڵ ڕاستەوخۆ خەوم لێدەکەوت تا بەیانی. کە بوو بە کاتژمێر ١٠ زیاتر لەو پارەیەم وەرگرت کە بیرم لێدەکردەوە. بەڕێوەبەرەکەی ئەوێ زۆر ڕازیبوو لێم و گوتی؛ "هەموو ڕۆژێک وەرە".

کاتژمێر ١١ گەیشتمەوە ماڵەوە و هێزم تیادا نەمابوو. ڕۆژی دواتر درەنگ دەچووم بۆسەر کار، بەڵام دەبوو زوو هەستم لە خەو تا دیارییەکان لە یاریدەدەری بەڕێوەبەر وەربگرم و بیبەم بۆ دوکانەکە. کەمێک قسەم لەگەڵ دایکم کرد؛ گوتی باشە و ئەمڕۆ

لەلای دراوسێکەمان بووە و پرسیاری پسوڵەکانی کرد. هێشتا ئاو و گاز لە ماڵماندا نەبوو و سێ چوار ڕۆژیتر کارەباکەشمانیان دەبڕی. گوتم؛ "بەیانی چارەسەری دەکەم دایە خەمت نەبێ. دەبێت بخەوم، زۆر ماندووبووم." و ڕۆیشتمە ژوورەکەم.

ئەها گوتم یان لە ئازاردا خەوم لێ ناکەوێت یان وەک منداڵ خۆش خۆش دەخەوم، کە چوومە سەر جێگاکەم سەرەتا لە ئازاردا خەوم لێنەکەوت، بەڵام دوای کەمێک بورامەوە و خەوتم. بەیانی بە دەنگی تەلەفۆنەکەم خەبەرم بوەوە. یاریدەدەری بەڕێوەبەر هاتبووە نزیک ماڵمان، لە خوارەوە چاوەڕێی منی دەکرد. بەپەلە خۆمگۆڕی و چوومە دەرەوە، دایکمم هەر نەبینی. قسەم لەگەڵ یاریدەدەری بەڕێوەبەر کرد و باسی ئەوەمان کرد کە دەبێت دیارییەکان بە چەند بفرۆشمەوە. لەوە دەچوو قازانجێکی باشم بۆ بمێنێتەوە.

لەو دۆخەدا هەر چەنێکم بۆ بمایەتەوە هەر باشبوو، ئامادەبووم هەموو کارێک بکەم. بە کورتی فێربووم دەبێت بە کوێی بفرۆشم و چۆن پەیوەندیان پێوە بکەم. پێیگوتم دەتوانێت یارمەتیم بدات لە هەڵگرتنیان و تا ئەوێ بمگەیەنێت. گوتی؛ "من چاوەڕێت دەکەم تا دەچیت و دەیفرۆشیت، دواتر دەتهێنمەوە." لەبەر ئەوەی ماڵمان زۆر نزیکبوو لەیەکەوە، بەڕێکەوتین. گفتوگۆیەکی خۆشمان کرد. ئەویش یەکێک بوو لەوانەی وابیرم دەکردەوە کە کەسێکی باشە. کەوتینە باسکردنی کێشەکانمان بۆ یەکتری. ئەویش کێشەی لەگەڵ خێزانەکەیدا هەبوو، هەروەک من. کە بۆم باس کرد زۆر

خەمباربوو. هەرچەندە جیاوازی تەمەنمان هەبوو، بەڵام وەک دوو دۆست هەڵسوکەوتمان لەگەڵ یەک دەکرد. وەک براگەورەیەک هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم و منیش لە وەڵامدا وەک برابچوکێک هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکرد. ئەو کاتە لە هەموو شتێک زیاتر پێویستم بە برا گەورەیەک هەبوو...

گەیشتینە دوکانەکە، چووم تا دیارییەکان بفرۆشم. قسەم لەگەڵ هاورێیەکی دیکەم کرد کە دەبووە نێوەندگیر و چووینە ناو دوکانەکەوە. خاوەنی دوکانەکە کەسێکی ساردبوو. نازانم چۆن باسی بکەم، بەڵام ڕووداوەکانی ژیان بە ڕوخسارییەوە دیاربوو. چرچەکانی دەموچاوی زۆر قوڵ بوون؛ لە کەسێک دەچوو کە ئازاری زۆری چەشتبێت و دەمێک بوو ناوەڕاستی تەمەنی تێپەڕاندبوو، و کەسێکی زۆر کەمدوو بوو، زۆر ئارەزووی گفتوگۆی نەدەکرد، بەڵام لەوە دەچوو منی خۆشویستبێت. دانیشتم، چا و قاوەمان خواردەوە و پاشان دیارییەکانم پێ فرۆشت و پارەکەم لێ وەرگرت. کەمێک زیاتر گفتوگۆمان کرد و پێم گوت هەموو کاتێک دیاری لەو جۆرە دەهێنم و ئەویشت گوتی کە هەمیشە لێم دەکڕێت.

من دڵخۆشبووم بەم دۆخە، چونکە دیارییەکانم بە نرخێکی زۆر زیاتر لەوە فرۆشتبوو کە بیرم لێ دەکردەوە. لە ڕاستیدا نرخەکان ئاسایی بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی کارەکەم نەدەزانی و ئەو پارەیەش لە دیارییەوە دەستم کەوتبوو زۆر بوو بەلامەوە، چونکە بەقەدەر مووچەی مانگێکم بوو. زۆر دڵخۆشبووم،

چونکە ئەم پارەیەی دەستم دەکەوت زۆر بەسوود دەبوو بۆم. پارەکەم وەرگرت و چوومەوە ناو ئۆتۆمبێلەکە و پارەکەم دا بە یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکە. پارەکەی ژمارد و گوتی: "تۆ بەشی خۆتت هەڵگرتووە، وانییە؟" منیش گوتم: "نەخێر کاکە، چەندم وەرگرتووە بۆم هێناویت. خۆی نەدەبوو هەر ئەمەنە وەربگرین؟" گوتی: "بەڵێ، بەڵێ" پارەیەکی دەرهێنا و پێمیدا. ئەو پارەیە هێندە کەمبوو کە ئەگەر ئەو خۆی منی نەهێنایە تەنها بەشی کرێی پاس و سمیتێک و ماستاوێکی دەکرد، بەڵام هیچم نەگوت، تێنەگەیشتم مەسەلە چییە...

**وامەزانە کە بە تەنهایت،**
**دۆستایەتی مرۆڤەکان تا ئەو شوێنەیە**
**کە بەرژەوەندییان لەگەڵتدایە،**
**تێبگە لەمە!**



## ئەگەر چاوەڕێی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لە خودا بکەیت، ئەوا ئەگەر هیچیشت بۆ نەمێنێت هەر بەتەنها نابیت...

دووبارە بەڕێکەوتین، بەڵام ئەو گفتوگۆ خۆشەی ڕێی هاتنمان نەبوو، هەردووکمان بێدەنگ بووین. من دڵم شکابوو، ئەویش هەستی پێکردبوو و گوتی؛ "بۆچی هیچ قسە ناکەیت؟" منیش یەکسەر گوتم؛ " کاکە ئەو پارەیەی بە منتدا کەم نییە؟" لە بەرامبەر ئەم پرسیارەدا کەمێک شڵەژا، وەک ئەوەی چاوەڕێی نەکردبێت. یەکسەر ڕوخساری گۆڕا و گوتی؛ "زۆر داوای لێبوردن دەکەم نەمزانی." و ئەوەندەی تری پێدام. ئەم پارەیەی وەرم گرت لە کوێ، ئەو پارەیەی دیارییەکانم پێ فرۆشت لە کوێ و ئەو پارەیەی پێی دام لە کوێیە...

بیست دانە دیاریم فرۆشتبوو، بەڵام ئەو پارەی یەک لەسەر دەی یەک دیاری پێدام، منیش دەمم داخست و دەستم کرد بە بیرکردنەوە، چونکە ئەم فرۆشتنە هەموو ئومێدی من بوو. لەو کاتەدا یاریدەدەرێکی دیکەی بەڕێوەبەر پەیوەندی پێوە کردم و گوتی دیارییەکانی دەفرۆشێت، نەمتوانی دڵیشم خۆشبێت، گوتم نەوەک ئەویش وەک ئەم بێت و گوتم؛ "باشە کاکە، دەیفرۆشین."

گوتی؛ "با هەر ئێستا بێم و هەڵتبگرم، لە کوێیت؟" منیش ناونیشانی ماڵەوەم پێدا تا بێتە ئەوێ، کە گەیشتینەوە نزیکی ماڵمان لێک جیابووینەوە و ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە یاریدەدەرەکەی ترەوە کرد. کاتێک چاوەڕێی ئەوم دەکرد بە بۆڵە بۆڵەوە جگەرەیەکم داگیرساند. نەمدەتوانی ئارام بگرم، ئارامیم نەمابوو، دەرد و خەمەکان بەسەر یەکەوە هاتبوون و بەڕاستی بێزار بووبووم. ئەگەر بمزانیایە دایکیشم دەچێت بۆ ماڵ پاککردنەوە ئەوا زیاتر دەڕوخام.

لە کۆتاییدا یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکە هات بە شوێنمدا، ئەمیان خوێنگەرمتر بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پێشتر بریندار کرابووم، بە ساردی هەڵسوکەوتم لەگەڵ ئەمیاندا دەکرد. پێی زانی و گوتی؛ "چی بووە ئاسلان، لەوە دەچێت بێزار بیت؟" و زەردەخەنەیەکی کەمی کرد. لە وەڵامدا گوتم؛ "وازی لێ بێنە کاکە، ئیش و کارە ئیتر". پێی گوتم ئاسوودەبم و بەڕاستی پارەمان دەست دەکەوێت، ئەو پارەیەی لە دیارییەکانەوە دەستی دەکەوێت بێ بەهایە بۆی و منیش هێندەی ئەوم دەست دەکەوێت و پێی گوتم سەری کوشنی دواوە بکەم. کە سەیرم کرد باوەڕم بە چاوەکانم نەکرد، چونکە دنیایەک دیاری لێبوو، بەڵام گوتی؛ "لەسەرخۆبە، هەمووی نافرۆشین، بەشێکی دەفرۆشین، بەڵام وردە وردە هی زیاتریش دێت، زیاتر دەفرۆشین و پارەی زیاترمان دەست دەکەوێت". زەردەخەنەیەکم کرد. بەڕاستی زەردەخەنەیەکی گەرمی خستبووە سەر ڕوخسارە ساردەکەم...

لە ڕێگا گفتوگۆی زۆرمان کرد، کاتی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە بۆیە بەباشی بیرم نایەت، بەڵام بەڕاستی گفتوگۆیەکی گەرم و گوڕمانکرد و گەیشتینە دوکانەکە. دووبـارە بـەرەو دوکانەکە ڕۆیشتم، ئەمجارە دوو جانتا دیاریم پێبوو، جاری پێشوو یەک جانتام بردبوو. دوکاندارەکە کە منی بینی سەری سوڕما و گوتی؛ "تازە لێرەبوویت، خێرە، کێشەیەک هەیە؟" کەمێک نا ئارام بوو، تێنەگەیشتم بۆچی بەڵام پێم گوت کە هیچ نەبووە و گوتم؛ "پێت گوتم کە کەی ویستم دەتوانم دیارییەکانت بۆ بهێنم".

دانیشتم و گوتم؛ "کاکە قاوە دەخۆمەوە." داوای ئاویشم کرد، چونکە زمانم وشک بووبوو لە ماندوێتیدا. یەکسەر جانتاکانم کردەوە و نیشانمدا، چاوی دوکاندارەکە زەق بوەوە و گوتی؛ "ئۆۆووو، گەنجینە!" و پرسی؛ "ئەمانەت لە کوێ بوو؟" گوتم؛ "تۆ کاڵەکەکە بخۆ و پرسیاری بێستانەکەی مەکە کاکە" و پێکەنیم. دەستی کرد بە ژماردنی دیارییەکان، بـەڵام گوتی پارەی لەلا نەماوە و داوای کرد کەمێک چاوەڕێ بکەم تا دەچێت بۆ بانک و پارە ڕادەکێشێت. ڕێک پێشبڕکێم لەگەڵ کاتدا دەکرد. گوتم؛ "باشە کاکە، بەڵام دەتوانی کەمێک خێرا بکەیت؟" کە ڕۆیشت چاوێکم بە دوکانەکەدا گێڕا؛ دوکانێکی بچووک، چۆڵ و بێدەنگ بوو، بەڵام کڕیاری جێگیری خۆی هەبوو و خاوەنەکەشی کەسێکی باشبوو کە داشکاندنی لە سەدا چلی بۆ هەموو کاڵاکانی دەکرد و بوارێکی دیاری تایبەت بە خۆی درووست کردبوو، دیاربوو کە دڵی زۆر پاکە.

دوکانەکەم زۆر بە دڵ بوو، لەبەر خۆمەوە گوتم؛ "ماشاءالله" بەڵام خەریکبوو درەنگ دەکەوتم بۆ سەر کار، ئەگەر درەنگ بکەوتمایە لەوانەبوو پارە لە مووچەکەم ببڕن، چیتر گرنگیم بە هەموو ئەگەرێک دەدا. دواتر دوکاندارەکە هات و پارەکەی پێدام، منیش بە خێرایی بەرەو ئۆتۆمبێلەکە ڕۆیشتم. مێشکم پڕ بووبوو لە بیرۆکە: "خۆزگە بە دوو ڕۆژ جارێک ئەمەم بکردایە"، "خۆزگە هەموو جارێک ئاوا پارەی زۆری دەدامـێ." خۆزگە خۆزگە خۆزگە... هەڵەم دەکرد بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم، چونکە خودا دەفەرموێت؛ "با هیچ بەندەیەکم داوای قەیتانی پێڵاوێکیش لە کەس نەکات، با لە منی داوا بکات، من پێی دەدەم."

بـەڵام ئەو کاتە هیچ بە مێشکمدا نەدەهات جگە لە گوتنی؛ "خودایە یارمەتیم بدە". نەمدەزانی کە لە شوێنی هەڵەدا بە دوای یارمەتیدا دەگەڕێم. دەڵێن؛ "مرۆڤ شیری کاڵی خواردووە." ڕاستە، تۆش و منیش و هەموو کەسێک شیری کاڵمان خواردووە...

گەڕامەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە، پارەکەم بۆ درێژکرد، بەڵام وەری نەگرت. ڕووی تێکردم و گوتی؛ "بەشی خۆت جیا بکەرەوە، چەندت دەوێت هەڵی بگرە". سەرم سوڕمابوو، بۆ خاتری خوا کێ ئاوا بە کێ دەڵێت؟ وامزانی گاڵتە و شت دەکات، سەرەتا تێنەگەیشتم، بەڵام ئەو بەڕاستی بوو. دەیگوت؛ "دەی کوڕم چەنت دەوێت هەڵیبگرە و بمدەرێ با منیش بە کەیفەوە بیژمێرم." بەڵام ئەو پارەیە زۆر زۆر بوو، نزیکەی دوو مووچەی من بوو. لەوانەیە ئەو بڕە بەلای زۆر کەسەوە زۆر نەبێت، بەڵام لە ئێستادا وەک

دەرمان وابوو بۆ من و دەبووە دەرمانی دەردەکانم، هەمووی لەدەستمدا بوو، و دەیگوت دەبێت خۆم بەشی خۆم دیاری بکەم. گوتم؛ "من ناتوانم بیکەم، هەقی من چەندە خۆت ئەوەندەم بدەرێ." و دووبارە پارەکەم بۆ درێژکردەوە.

پێکەنی، گوتی؛ "کــوڕم... ئـەگـەر ئـاوابـیـت لـە بـازرگـانـیدا زۆر پێت پیادەنێن. بازرگانی هێندە ڕاستگۆ و پاک نییە وەک ئەوەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە، بازرگانی ئەنجامدانی ئەوەیە کە بەرژەوەندی خۆتی تێدایە، خۆت ناخەیتە مەترسییەوە بۆ کارێک کە بەرژەوەندی تۆی تێدا نییە." کە وای پێ گوتم پرسیارێک بە مێشکمدا هات؛ نەمدەزانی مەترسی ئەم کارە چییە. پێش پارەکە پرسیاری مەترسییەکەم کرد و گوتم؛ "کاکە مەترسی چی تێدایە؟" و دووبارە پێکەنی. کە گوتی؛ "ئاسلان تۆ باشیت؟ دیاری دەبەیت بۆ دوکاندارێک. ئەگەر کەسێک ئەمە ببینێت لە کار دەردەکرێیت، لەکۆتاییدا ئەمانە دیارین. باشە شتێکی نا یاسایی ناکەیت، بەڵام ئەمە بە شتێکی ئاسایی سەیر ناکرێت لە بواری ئێمەدا."

وەک ئەوە وابوو تەشتێک ئاوی کوڵهاتوو بکەن بەسەرمدا. من چیم کرد؟ بێ ئەوەی بزانم، چووم کارێکی نەخوازراوم کرد لەبەر ئەوەی کێشەی داراییم هەبوو. وامدەزانی هیچ مەترسییەکی تێدا نییە، ئەو کاتە نەمتوانی بیر لە هیچ بکەمەوە؛ تەنها پێویستم بە پارە بوو، و بۆیە ئەم کارەم کرد؛ بیرم لە هیچ شتێکی دیکەی نەکردبوەوە. ئێستاش تەنها بیرم لە مەترسییەکەی دەکردەوە. نە پارە و نە پسوڵەکان، هیچ شتێک بە خەیاڵمدا نەدەهات. بانگی

کردم و گوتی؛ "ئارامبەرەوە"، دووبارە سەرم بەرزکردەوە. گوتی؛ "هەتا کار لەگەڵ کەسانی خاوەن متمانەدا بکەیت کەس پێی نازانێت، ئاسوودە بە. ئەگەر بشبیستریت ئەوە ئەوپەڕەکەی لە کار دەردەکرێیت، لە شوێنێکیتر بەردەوام دەبیت لە کارکردن." بەڵام نەمدەویست بیریش لەوە بکەمەوە ئەگەر لە کار دەربکرێم چی بکەم. وەک ئەوەی لە گۆرانییەکەدا دەڵێن؛ دەرد وەک دەریایە و منیش بەلەمێکم و بەناویدا مەلە دەکەم. ئەگەری هەڵگەڕانەوە و نوقوومبوون لەم دەریایەشدا هەیە، بەڵام من هیچ بیرم لەمە نەکردبووەوە.

دووبارە پەنام بردەوە بەر ئەو کەسەی لە تەنگانەدا پەنای بۆ دەبەم و لە دڵخۆشیدا بیرم نییە، پەنام بردەوە بەر خودا و داوای یارمەتیم دەکرد. دواتر خۆم بۆ نەگیرا و لە خۆمم پرسی: "تۆ کە دڵخۆشیت سوپاسی خودا ناکەیت و نزا ناکەیت و کە دەکەویتە تەنگانەوە و دەرد دەبێت بە دەریا ئینجا پەنا بۆ خودا دەبەیت ئەی ئاسلان! خودا قبوڵت دەکات؟" دواتر وەڵامی پرسیارەکەمم دایەوە و گوتم؛ "بەڵی قبوڵت دەکات، چونکە خودا لە هەموو کەسێک بەخشندەتر و لێبووردەترینە." دووبارە چڵە دارێکم دۆزیبووەوە تا خۆمی پێوە بگرم...

کاتێک بەردەوامبووین لە ڕۆیشتن، یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکە پارەکەی بژارد و بەشێکی درێژکرد بۆم. گوتی؛ "هانێ براکەم، بەمانە چارەسەری کێشەکانت بکە. مادەم دابەشکردنی بەشەکەت بۆ من جێهێشت ئەوا منیش وەک بەشی برا گەورە و برا بچووک

بەشم کرد". کە پارەکەم بژارد بینیم کە بەڕاستی یەک لەسەر چواری پارەکەی دابوو بە من، براگەورەیی نواندبوو، چاوەکانم پڕ پڕ بوو. ئەوکاتە بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتەیەوە چاوم پڕ بووبوو نەک بەهۆی پارەکەوە، چونکە براگەورەیی، باوکایەتی وهاوڕێیەتی وەهام نەبینیبوو؛ ئەها گوتم خزمەکانیشمان پەیوەندیشمان پێوە ناکەن، ئیتر ئێوە بیر لەوەیتری بکەنەوە...

مرۆڤ کە کەوت دۆستی نامێنێت، کێ چی دەڵێت با بیڵێت، بەڵام ئەو کاتە کەست لەلا نامێنێت، بەڵام مرۆڤ پێویستی بە کەس نییە، جگە لە خودا. ئەگەر خودا لەگەڵ تۆ بێت ئەوا هەموو دونیاش یەک بگرن ناتوانن تۆ ببەزێنن. چی دەڵێت لە سورەتی فیلدا؟ "لەلای ئێمە ئەگەر خودا بیەوێت ئەوا باڵندە فیل دەبەزێنێت." لەو کاتەدا خودا بە هانامەوە هات، هەستم پێکرد. هەر پارەکەی ناو دەستمم دەبژارد و دەبژاردەوە، بە لایەنی کەمەوە سێ چوار جار پارەکەم بژاردەوە تا ئەو دەنگە گوتی؛ "کوڕم بەس بیبژێرە ئەڵێی پارەت نەبینیوە". لەبەر ئەوەی هاوڕێکەی دیکە لە پشتەوە لێیدام، هیچم بۆ ئەم باس نەکردبوو لەبارەی کێشەکانمەوە. هاوڕێکەی تر زۆر بە باشی فێری کردم نابێت باسی کێشەکانت بۆ هەموو کەسێک بکەیت. لەگەڵ ئەم هاوڕێیەدا باشتر تامی هەستی متمانەکردن و متمانەپێکراویم کرد و فێری کردم کە هەرچییەک ببێت دەبێت قازانجی کار و بازرگانییەکان وەک بەشی براگەورە و برا بچووک بەش بکرێت، ئەگەر لەڕێگەی کەسێکەوە پارەت دەست بکەوێت دەبێت خزمەتی ئەو کەسەش بکەیت.

چیتر ڕووداوەکانم تەنها وەک وانەیەک دەبینی. میشکم سەیری دەکرد و دەیگوت دەتوانم چی لە کامیانەوە فێر ببم؟ لەوانەشە ئەمانە گەورەیان کردبێتم، پێیان گەیاندبێتم و کردبێتیانم بە میوەیەک. پێم گوت کە دەبێت فریای کار بکەوم و گوتم؛ "کاکە خێرا بکە، درەنگ دەکەوم." و خێراتر بووین. کاتێک بەرەو سەر کار دەڕۆیشتین هەستم بە جوانی ئۆتۆمبێلەکە کرد. یاریدەدەرەکەی دیکەش ئۆتۆمبێلێکی زۆر جوانی هەبوو، هەرچەندە لەبەر ئەوەی ئێمە هەرگیز نەمانبینیوە ئۆتۆمبێلێکی مامناوەندیشمان زۆر بە گرانبەها دەزانی. لە دڵی خۆمدا دەمگوت؛ "ماشاءالله"، کە ئۆتۆمبێلەکە دەستی بە خێرابوون کرد کەمێک ترسام. لە ناکاو زۆر نزیکبووینەوە لە ئۆتۆمبێلێک، هەرچەندە لەسەر کورسی سەکن دانیشتبووم، هەوڵمدا پێ بەو ئیستۆپەدا بنێم کە هەر بوونی نەبوو، و هاوڕێکەم دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی؛ "کوڕم مەترسە ئەمە خۆی دەگرێتەوە. ناتوانیت لەوێوە پێ بە ئیستۆپدا بنێیت. خەمت نەبێ بەپێی خێراییەکەی ئیستۆپیشیان بۆ داناوە." و بە قاقاوە تێر بەمە پێکەنین. دەموچاوە ساردەکەم ئیتر پێدەکەنی...

لە کۆتاییدا گەیشتمە شوێنی کارەکەم. ئامێری پەنجەمۆری لێبوو. هەروەک گوتم، ئەگەر درەنگ بکەوتمایە لە مووچەکەمیان دەبڕی. بەم ترسەوە لە کۆتا خولەکدا پەنجەم خستە سەر ئامێرەکە. ئەو خەمەشم لە کۆڵ بوەوە، ئێستا دەبوو بیر لە پسوڵەکان بکەمەوە. نەمدەتوانی خەیاڵم لای کارەکەم بێت.

لە ڕاستیدا هەرچەندە تازە دەستم بەو کارە کردوو و هێشتا ساڵێکم تەواو نەکردوو، بەڵام یەکەمی هەموو فرۆشگاکەبووم لە کارەکەمدا. کەسێکبووم کە زوو فێری فرۆشتن دەبووم و کارەکەشمان فرۆشتنی کاڵای مارکەی گرانبەها بوو. دیقم کرد هەتا فێری خوێندنەوەی ئەو ناوە ئینگلیزی و ئەڵمانیانە بووم، لەبەر ئەوەی من هیچ فێری ئینگلیزی نەبووبووم، هەر لە وانەکان ڕامدەکرد، چونکە ئەو وانانە هەمیشە زۆر قورسبوون بەلامەوە، بەڵام نەمدەزانی کە لە کاری فرۆشیاریشدا پێویسم پێی دەبێت. بەڕاستی واملێهاتبوو هەمیشە وانەم لە ڕووداوەکانەوە دەردەهێنا. ڕۆژەکانم بە گوتنی؛ "ئاخ ئاسلان، وای ئاسلان..."ەوە تێدەپەڕی، باشە ئەو ڕۆژانەی لای من ئاوا تێدەپەڕین بۆ دایکم بە هەمان شێوەبوون؟

ژنە داماوەکە ئاو و گاز لە ماڵەکەیدا نەبوو، سێ ڕۆژی دیکە کارەباکەشیان دەبڕی، کێشەی کرێی هەبوو، کوڕەکەی لە سەربازیبوو و کچەکەی تازە دابوو بە شوو، مێردەکەشی ڕۆیشتبوو... بەس من و دایکم مابووینەوە...

هەستم بەوە کرد کە هەرگیز دایکم وشەیەکی خراپی نەگوتووە، نە نارازی بووە نە هیچیتر. تەنانەت نەشیگوتووە؛ "بۆچی؟" بەڵێ هەموو کاتێک بە ڕووخساریدا دیاربوو خەمبارە، بەڵام هەر زەردەخەنەیەکی لەسەر دەم بوو. لەوانەیە بەهۆی ئەمەشەوە بووبێت کە لە ناو ئەم هەموو سەختییەدا هەستم بە بەهێزی خۆم دەکرد. هەر کاتێک بە دایکمم بگوتایە؛ "چی بکەین؟" دەیگوت؛

"خودا لەگەڵ ئێمەوە" و تـەواو. باشترین شت کە لە دایکمەوە فێری بوویێتم متمانەکردنی بێ پایانە بە خودا.

ئەم دەردانە ئەگەر لەسەر شانی منی گەنج هێندە قورس بن، دەبێت لەسەر شانی دایکم و کەسێکی ئەو تەمەنە زۆر قورستر بێت. کەچی هێشتاش هەمیشە زەردەخەنە لەسەر ڕووخسارە جوانەکەی بوو. هەموو ساتێک دڵم هەر لەلای دایکە جوانەکەم بوو...

لە ڕاستیدا دایکی هەموو کەسێک بۆخۆی جوانـە، دایکی هەموو کەسێک بۆخۆی تایبەتە و تاقانەی ڕۆڵەکانیانن. هەموو دایکەکان جوانن و بەهەشت لە ژێر پێی ئەواندایە. بوون بە دایک بەهرەیەکە و هەموو کەسێک ناتوانێت ببێتە دایک و شایەنی ئەو پلەیە نییە. هەموو ڕۆژێک کە گوێ لە هەواڵەکان دەگرین بۆمان دەردەکەوێت کە بە منداڵ خستنەوە کەس نابێت بە دایک. بوون بە دایک شتێکیترە... لە هەر کەسێک دەپرسم، ناتوانێت باسی خۆشەویستی خۆی بەرامبەر دایکیم بۆ بکات. دایک پێناسە ناکرێت، ئەو جوانتری عاشقە، دایک گیانە، دایک هاوسۆزییە، دایک ڕێزە، دایک ئەو کەسەیە کە ڕۆیشتن و ڕاکردنت فێردەکات، فێرت دەکـات چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ بەرامبەر بکەیت کە گەورە بوویت، دایک مامۆستای خۆشەویستییە، دایک ژیانە، دایک خۆرە، بە کورتی دایک هەموو شتێکە... بەتایبەتی بۆ کوڕ زۆر جیاوازە. من دایکمم زۆر خۆشدەوێت و تا کات هەیە زوو زوو ئەمە دەردەبڕم، تۆش تاقی بکەرەوە. دایکەکانمان هێندە خەم و

خەفەتیان بۆ خواردووین شایەنی ئەوەن هەموو ڕۆژێک دوو ڕستەی خۆش ببیستن. هەمیشە ئەم بەسەرهاتەم بیردێتەوە:

کاتژمێر سێ و نیوی بەرەبەیان زەنگی تەلەفۆن لێدەدات. پیاوەکە بە خەوالوییەوە وەڵامی تەلەفۆنەکە دەداتەوە، دەنگی ناو تەلەفۆنەکە دەنگی دایکییەتی. دەترسێت لەوەی شتێکی بەسەردا هاتبێت. دایکی دەڵێت؛ "کوڕم چۆنیت باشیت؟" کوڕەکەی بە سەرسوڕمانەوە دەڵێت؛ "باشم دایە. خێرە، شتێک بووە؟ تۆ باشیت؟" دایکی دەڵێت؛ "باشین کوڕم هیچمان نییە. تەنها ویستم گوێم لە دەنگت بێت". کوڕەکەش دەڵێت؛ "دایە بۆ ئەمە بەم کاتە پەیوەندیت کرد؟ کاتژمێر سێ و نیوی بەرەبەیانە، دەمانتوانی بەیانیش قسە بکەین". دایکی بە دەنگێکی خەمبارەوە دەڵێت؛ "کوڕم بێزارم کردیت؟" هەرچەندە لە ڕاستیدا کوڕەکە هەرگیز نەیدەویست دایکی خەمبار بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا خەبەری کردبوەوە بۆ ساتێک هۆشی لەسەر خۆی نەما و بە توڕەییەوە گوتی؛ "بەڵی دایە بێزارت کردم". دوای ئەمە دایکی دەڵێت؛ "سی ساڵ پێش ئێستا تۆش لەم کاتەدا بێزارت کردم کوڕم. یادی لەدایکبونت پیرۆزبێت." و پاشان تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە.

نازانم کێ چی لەمە تێدەگات، بەڵام هەر کاتێک بیخوێنمەوە چاوەکانم پڕ دەبن. هیوادارم چاوی ئێوەش پڕ ببێت. دایکان تایبەتن، پێناسە ناکرێن، ڕووننا‌کرێنەوە و ناپێورێن... بە منداڵی من لە خوشک و براکانم زیاتر هۆگری دایکم بووم، هەرچەندە من زۆر ئەمەم بە بیر نایەت، بەڵام دایکم و خوشکە گەورەکەم

هەمیشە باسی دەکەن. دەمەوێت باسی بیرەوەرییەکی خۆمتان بۆ بکەم.

تۆ بڵی حەوت، من دەڵێم هەشت ساڵ بووم، و دایکیشم دەڵێت نۆ ساڵ بووم، نیوە شەو کاتێک هەمووان خەوتوون ١٠-١٥ پەتاتەم هێناوە (وامزانیوە شەش کەس هەر ئەوەندەی پێ دەخورێت) دانیشتووم توێکڵی هەموویم پاککردووە و تێبینییەکی بچووکیشم نووسیوە و لەلایەوە دامناوە:

"دایکە جوانەکەم، خۆ نابێت هەر دەستەکانی تۆ ماندوو بن، با کەمێک ئەوانەی منیش ماندوو بن. زۆرم خۆشدەوێیت".

هەرچەندە لەلای ئێمە خوارد ئامادەکردن وەک ئەرکی دایکم دەبینرا، بەڵام لەو تەمەنەشدا ئاوا بەویژدانبووم بەرامبەر دایکم.

کەس دەتوانێت پێناسەی ئەمە بکات؟

بەرای تۆ دەمتوانی دیارییەکی لەمە جوانتر پێشکەشی دایکم بکەم؟

ئەم بیرەوەرییە هەمیشە لە یادی دایکمدایە. ئێستاش بەخۆم دەڵیم؛ "باشبوو ئەوەم کردووە"...

لەبیری مەکە هەرگیز درەنگ نییە بۆ هیچ شتێک. سوپرایزی جوان بۆ دایکتان بکەن، خۆزگە دەتانزانی ئەوان چەند دڵیان پێی خۆشدەبێت ئەگەر سوپرایزێکی بچووکیشبێت. دایکم هەمیشە دەڵێت؛ "هەتا نەبیت بە دایک لێم تێناگەیت". من کورم ناتوانم ببم بە دایک، بەڵام لەوانەیە کە بووم بە باوک کەمێک لە خۆشەویستی مندال تێبگەم...

خودا دەزانێت ئایا دەبم بە باوک یان نا...

کەمێک قسەی دڵمم بۆ کردن. با ئێستاش بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان...

دەبوو پارە بکەمە ناو کارتی ئاوەوە، پارەی پسوڵەی کارەبا و گازی سروشتیش بدەم، بەڵام پارەکەم بەشی نەدەکرد، چونکە پارەی چوار مانگ کۆبووبووەوە. تەنها دەمتوانی کەمێک ئاو بکڕم، ئەوەندەی بەشی یەک دوو هەفتەمان بکات. دەبوو پارەی هەموو پسوڵەکانی گازی سروشتی بدەم تا بۆمان ببەستنەوە، بەڵام پارەکەم بەشی ئەوەی نەدەکرد. بۆ کارەباش دەبوو پارەی تەنها کۆتا پسوڵە بدەم تا کارەباکەمان نەبڕن، پارەی کۆتا پسوڵەم دا و کەمێک پارەم پێ مایەوە. بڕاردم و گوتم: "کە مووچەم وەرگرت پارەی هەمووی دەدەم" و پاشان بڕیارمدا بچم شتومەک بۆماڵەوە بکڕم بەو پارەیەی کە ماوە...

یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانم لە فرۆشگاکە هات بۆلام و گوتی: "خەیاڵت لە کوێیە کوڕە؟ هیچیشت نەفرۆشتووە، ئاوا بڕوات زیادەش وەرناگریت. سەیری کاشێرەکەم کرد ئەمڕۆ هیچت نەفرۆشتووە. ئەمە دوایی دەبێت بە کێشە بۆت". بەڕاستی هیچم نەکردوو، نە گرنگیم بە کڕیارەکان دابوو نە ڕەفەکانم چاککردبوو نە فرۆشگاکەم پاککردبووەوە... هیچم نەکردبوو، چەندین کاتژمێرە هەر دەسوڕێمەوە. دیارە بەڕێوەبەریش سەرنجیداوە بۆیە بانگی کردم بۆ ژوورەکەی. بە کورتی هەر بۆڵە بۆڵی کرد و گوتی: "ئاسڵان، کێشەیەکت هەیە و نازانم چییە، بەڵام دەبێت هەر ئێستا

بێیتەوە سەر خۆت و بچیتەوە سەر کارەکەت. هیچت نەفرۆشتووە و گرنگی بە کەسیش نادەیت".

مرۆڤ هیچ نەبێ دەڵێت چیتە؟ نەک هەر بڵێ؛ "نازانم چیتە بەڵام..." وانییە؟

لێرەدا من فێری ئەوە بووم کە ئەگەر هەستم کرد کەسێک کێشەیەکی هەیە دەبێت لێی بپرسم و لێی قوڵ ببمەوە. لە پلانمدابوو چەند شتێک بفرۆشم و ڕۆژەکە تەواو بکەم. هەر چاوەڕێبووم کاتژمێر ببێت بە ١٠ی شەو و بڕۆمەوە. لە مێشکمدا پلانمدانابوو بەیانی کاتژمێر ٦ بڕۆمەوە و بە ڕاکردن بچم بۆ پاس شتن. کەمێک پێش ئێستا بە خۆمم گوت دەبێت ڕۆژەکانی دایکم چۆن بڕوات، ئەها گوتم نەمدەزانی دەچێت بۆ ماڵ پاککردنەوە. هەر وەک گوتم، پێی دەگوتم کە لەلای دراوسێکەمان، پورم، یان لە قورئان خوێندن یان لە مزگەوتە. لە هەموو شتێک زیاتر دەمویست ئێوارە زوو بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە و بە دایکم بڵێم؛ "کێشەی ئاو و کارەبام چارەسەر کرد و کە مووچەشم وەرگرت گازی سروشتیش چارەسەر دەکەم".

بوو بە کاتژمێر ١٠. لە فرۆشگاکە هاتمە دەرەوە سەر پاس کەوتم. دڵم زۆر بەپەلە لێیدەدا و نەمدەتوانی هێواشی بکەمەوە، دەمویست تەلەپۆرت بکەم بۆلای دایکم. هێندە بیری ئەو خۆشیانەم کردبوو ناتوانم پێناسەی بکەم، وە من لەمەش وانەیەک فێربووم: هەتا ڕۆژی ناخۆش نەیەت قەدری ڕۆژە خۆشەکان نازانین. جوانی ڕەش لە سپیدا و جوانی سپی لە ڕەشدا شاراوەیە. هەتا

ڕەش نەبێت سپی دەرناکەوێت. هەتا ڕۆژی ناخۆش نەبێت ڕۆژی خۆشیش نابێت. سوڕێکی چەند جیاوازە و چەند بەبێ کەموکورتی دروستکراوە بۆ مرۆڤ.

ڕامکرد بەرەو دوکانەکە و چەند شتومەکێکم کڕی. لیتریک ڕۆن، سەمون، جگەرە بۆ دایکم، جگەرە بۆ خۆم، پەنیر، زەیتون، ئەو بسکیتەشم کڕی کە دایکم حەزی لێیەتی، ئارەزووم لەهیچ نەبوو تا بۆ خۆمی بکڕم. بە ڕاکردن ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە. گڵۆپەکان کوژابوونەوە، وامزانی دایکم خەوتووە. کە چوومە ژوورەوە بینیم دایکم لە چێشتخانەکە دانیشتووە و مۆمێکی داگیرساندووە. گوتم؛ "دایکە چی بووە؟" گوتی؛ "کوڕم من پارەی پسوڵەکەی کارەبامدا. بەڵام چووینەتە مانگی پێنجەمەوە، بۆیە ئەمڕۆ هاتن و کارەباکەمانیان بڕی. پێدانی پارەی یەک پسوڵە بەس نەبووە". و دەستی کرد بە گریان. لە دۆخێکدابووم نەمدەزانی بسوتێم بۆ ئەوەی دایکم پارەی پسوڵەکەی داوە یان بۆ ئەوەی دایکە چاو جوانەکەم دەگری؟ بەڵام ناچاربووم بەهێزبم. نازانم چۆن بۆتان باس بکەم، بەڵام من کۆڵەکە و بناغەی ئەو ماڵە بووم. وا هەستم دەکرد ئەگەر من بڕوخێم هەموو شتێک لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکێشرێت و نامێنێت. خۆمم وەک قەڵایەک دەبینی کە نەدەبوو بڕوخێت. باوەڕدەکەیت نەمدەوانی بشڵێم؛ "ئای چیم بەسەرهات؟"

باوەشم بە دایکمدا کرد، منیش دەستم کرد بە گریان. هەوڵمدا دڵی بدەمەوە و گوتم؛ "باوەڕم پێبکە بەسەر هەموو ئەمانەدا زاڵ دەبین، باوەڕ بە من بکە، من لەلاتم."

بەڵام دایکم باوەڕی بە بەهێزی من کردبوو. گوتی؛ "باشە کە تۆم هەیە" و ئەویش باوەشی پێداکردم. دەمبینی کە ژیانم پێگەیشتووە و ڕۆحم ماندوو بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا گەورە دەبووم، ئەمە ڕاستییەکی تاڵبوو. ئاسلان دەبوو بە پیاو. تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، بەڵام ژیانی جیاوازبوو لە ژیانی هاوتەمەنەکانی. دایکمم ئارامکردەوە و شتومەکەکانم نیشاندا، تا کەمێک زەردەخەنە بکات. سوپاسی کردم، جگەرەکەی هەڵگرت و گوتی؛ "با یەکێک بکێشم، لە بەیانییەوە نەمکێشاوە". نەیتوانی بڵێت پێم نەکردراوە، ئەو نەیتوانی بیڵێت و منیش دانە دانە فرمێسکەکانم ڕشتە ناخمەوە.

دەزانیت فرمێسک چییە؟ ئەوە نییە کە لە چاوتەوە دەڕژێت، بەڵکو ئەوەیە کە دەڕژێتە ناختەوە. هەست بەو فرمێسکە دەکەیت، کاتێک دەکەوێتە دڵتەوە گرمەی لێوە هەڵدەستێت. دەڕژێتە ناو جەرگتەوە، دەیسوتێنێت و دەیڕوخێنێت و دەیکات بە خۆڵەمیش و ناشتوانیت هیچ بڵێیت. ناخت پارچە پارچە دەکات و ناتوانیت یەک دەنگیش دەربکەیت، ناتوانیت بڵێیت؛ "بوەستە مەڕژێ"، ناتوانیت ڕێگری لێ بکەیت. هەر دەڕژێت و هەموو ناخت پارچە پارچە دەکات... دووجار بیربکەرەوە کەتێک دەڵێیت ئەمە فرمێسکە و گریاوم...

لەو ساتەدا مێشکم لە کار کەوتبوو هیچی تێدا نەمابوو.

چاوەڕێبووم دایکم جگەرەکەی تەواوبکات تا ببیەم بۆ ژوورەکەی و بردم، پاڵمخست و دامپۆشی و پێمگوت؛ "دایکە... پارەم کردە ناو کارتی ئاوەکەوە، بە لایەنی کەمەوە بەشی دوو سێ مانگمان دەکات، خەمت نەبێ. بە زووترین کات کێشەی کارەبا و گازی سروشتیش چارەسەر دەکەم. نزا بکە و بە جوانی بخەوە، کوڕەکەت لەلاتە." لە کاتێکدا کە بەشی هەفتەیەک یان ئەوپەڕەکەی دوو حەفتە ئاومان هەبوو، درۆم کرد، بەڵام تەنها لەبەر دڵخۆشبوونی ئەو بوو. دایکیشم گوتی؛ "خودا لێت ڕازیبێت کوڕم، نزاکانم هەر بۆ تۆن. تۆش بە جوانی بخەوە." و ماچی کردم، کە ماچی کردم فرمێسکی چاوەکانی لەسەر ڕومەتم بەجێما. ڕوومەتم گڕی گرت و سوتا لەوێدا...

ئەمە شتێک نییە کە بتوانم بە وشە دەری ببڕم، هەندێک کات ناتوانم ڕوونی بکەمەوە، وشەکانم بەشی ئەمە ناکەن. چووم بۆ ژوورەکەم و دەستم کرد بە بیرکردنەوە.

چیم چۆن بکردایە؟ دەبوو بەپەلە دووبارە کار لەگەڵ ئەو یاریدەدەری بەڕێوەبەرەدا بکەم کە پارەکەی وەک برا بچوک و برا گەورە بەشکردبوو و دەبوو ئەمجارە ڕاستەوخۆ پێی بڵێم؛ "پێویستم بە پارەی زیاترە دەتوانم زیاتر هەڵبگرم؟" چونکە تەلەفۆنەکەشم کۆنبوو و سپاردەبوو لەلام و نەمدەتوانی ئەویش بفرۆشم. هیچ شتێکم نەمابوو بۆ فرۆشتن. ئەو مەدالیا ئاڵتونە هاتەوە یادم کە بە منداڵی دایکم بۆی کڕیبووم لە پاداشتی بەڕۆژووبوونمدا. یەکسەر دەستم کرد بە گەڕان بەدوایدا، بەڵام

بۆم نەدۆزرایەوە. بە تەمابووم بۆ بەیانی لە دایکم بپرسم لە کوێیە. بەڵام کاتێک بەماڵەکەدا دەگەڕام زانیم دایکم هیچ خشڵێکی نییە. مرۆڤ خەم دەخوات کاتێک دەبینێت دایکی یەک خشڵی جوانیشی نییە...

ژیان فێری کۆمەڵێک شتی دەکردم و بۆم دەردەکەوت کە چەند بێ ئامانج ژیاوم. تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو، بە دەم خۆشە بیست و دوو ساڵ، وە هەمووی بە هەدەر ڕۆیشتبوو. نە لە قوتابخانە نە لە کارێک نە لە بەهرەیەکدا سەرکەوتوو نەبووم...

بێ ئەوەی بزانم دەبێت چی بکەم سەرم خستە سەر سەرینەکەم و لێفەکەم دا بەخۆمدا، چونکە ماڵەکە تەواو سارد بووبوو؛ نە کارەبا هەبوو نە گازی سرووشتی بۆ خۆگەرمکردنەوە... کە درکم بەمە کرد دووبارە هەستامەوە و بڕیارمدا بەتانی براکەشم بدەم بە دایکمدا. بەتانییەکەم برد و پێمدادا. هێشتا نەخەوتبوو و گوتی؛ "سوپاس کوڕی خۆم".

ئەگەر دونیات تاریک بووە،
ئەگەر شەوەکانت بێ ڕووناکییە،
ئەوا پەنجە بنێ بە دوگمەی چاکەی ناو دڵتدا،
دایبگیرسێنە با بەرپێی خۆت ببینیت،
تا بزانیت کێ دۆستە و کێ دوژمنە.



**ئەگەر چاکە ڕەگی لە دڵتدا داکوتاوە،**
**ئەوا لە خراپترین ڕۆژەکانیشدا دەتوانیت چاکە بکەیت،**
**و بەربەستەکان لاببەیت و بەردەوامبیت لە ڕێگاکەت.**

ئەگەر کەمێکیش بێت دەمتوانی دایکم دڵخۆش بکەم، وە شانازیشم بەمەوە دەکرد.

ئەگەر بڕوخامایە کەس نەبوو هەڵمبستێنێتەوە، هەتا سەر ئێسقانیش هەستم بەمە دەکرد. پێش ئەوەی بخەوم چوومە بەردەم پەنجەرەکەم و سەیری ئاسمانم کرد. خانویەکم لە هەور درووستکرد، دایکیشمم برد و لەوێدا ژیاین و دڵخۆشبووین بۆ ماوەی پێنج خولەک...

نابێ خەیاڵیش بکەم؟ دیارە ئەوەشم پێ ناکرێت....

چوومە سەر جێگاکەم، زۆر ماندوو بووم، دەبوو بخەوم، چونکە بەیانی دەچووم بۆ سەر کار و لەوێشەوە دەچووم بۆ پاس شتن. واتە کاتژمێر ٩ی بەیانی لە ماڵ دەردەچووم و کاتژمێر ١١ی شەو دەهاتمەوە. دوو کارم دەکرد و دایکیشم وایدەزانی بەیانی کاتژمێر ١٠ دەچم بۆ فرۆشگاکە و کاتژمێر ١٠ دێمە دەرەوە. لەکاتێکدا من درۆم لەگەڵ دایکم دەکرد تا خەم نەخوات، ئەویش درۆی لەگەڵ دەکردم و دەیگوت: "لەماڵی پورتم"، "لەلای دراوسێکەمانم" و دەچوو بۆ ماڵ پاککردنەوە. ئێمە بێگوناهین، وانییە؟

درکم بەوە کرد کە چەندین ڕۆژە کەس پەیوەندی پێوە نەکردووم. بێگومان جار جار پەیوەندییەکم بۆ دەهات، بەڵام هەر چۆنی و چاکییەکی سادەیان دەکرد و لەوە تێنەدەپەڕی. کەس نەبوو لە خێزان و خزمەکانم پرسیاری دەرد و خەمەکانم لێ بکات. لەوانەشە هەرگیز نەپرسن. بەیانی هات و کاتی چوونە سەر کارم بوو، دووبارە هەستامەوە و خۆمم گۆڕی و بەردەوام بووم لە تێکۆشان... نزیکەی ١٥ خولەک بەپێ دەڕۆیشتم تا دەگەیشتمە وێستگەی پاسەکە، هەموو ڕۆژێک ئەو ڕێگایە وەک ئەشکەنجەبوو بۆم. کاتی ڕۆیشتن هەر باشبوو، بەڵام کاتی گەڕانەوە زۆر سەختبوو بۆم. هەر کە گەیشتمە شوێنی کارەکەم، داوای کۆبوونەوەیان کرد و چووینە کۆبوونەوەکەوە. لێپێچینەوەیان لێکردم لەبارەی ئەو کێشەی فرۆشتنەی چەند ڕۆژێکە هەمە، ڕاستە پرسیاریان لەهەموو کەسێک کرد، بەڵام لێپێچینەوەیان لە من دەکرد. نەمدەتوانی هیچ وەڵامێکیان بدەمەوە، چونکە لەسەر هەقبوون، مووچەیەکم لەوێ وەردەگرت و دەبوو لە بەرامبەر ئەوەدا کار بکەم، خۆ ناکرێ هەر دانیشم. واتە بەکورتی خۆم لە کارەکان دزیبوەوە و ئەمەش بەڕێوەبەرەکەی زۆر بێزار کردبوو...

ئەو ڕۆژە بە باشی دەستم بە کار کرد و بیرم لە باشترکردنی کارەکانم دەکردەوە. دووبارە فرۆشتنەکانم زیادیان کرد و گەیشتە پلەی یەکەم لە فرۆشگاکەدا. هەتا ئێوارە ڕەفە و شتەکانیشم ڕێکخستبوو، بەجۆرێک کارم دەکرد کە هەر بیرم نەمابوو کاتژمێر ٦ لە کار تەواو دەبم. کاتێک بیرم کەوتەوە دەبێت خۆم زۆر

ماندوو نەکەم کار لە کار ترازابوو، بەڵام ئەو ڕۆژەم زۆر بەباشی ڕۆیشت لە فرۆشگاکەدا.

کاتژمێر ٦ بەپەلە دەستم لە کار هەڵگرت و بە ڕاکردن چووم بۆ پاس شتن. کە گەیشتمە شوشتنگەی پاسەکە خاوەنەکەی پێکەنی و گوتی؛ "ئاه ئەوە دڕندەی پاسەکانیش هات. وەرە ئاسلان، ئەمڕۆ لە شانسی خۆت پاسی زۆر هاتووە بەم کاتە. دەی بوبینم، بڕۆ بەدلەکەت لەبەرکە." و ناردمی بۆ ژووری خۆگۆڕینەکە. کە دەڵێم ژووری خۆگۆڕین، هەر بەشێکیان لە دەستشۆرەکە جیاکردبوەوە، سوێند بە خودا لە تاو بۆنەکەی نەمدەتوانی لەوێ بوەستم. ئەگەر لە کاتی ئاساییدا کەسێک پێی بگوتمایە؛ "دەبێت لێرەدا خۆت بگۆڕیت." پێم دەگوت؛ "ئا بۆخۆت بڵێ".

کاتژمێر شەش و بیست خولەک دەستم بە کارکردن کرد و دەبوو زۆر زۆر کار بکەم، چونکە دەمزانی هەتا پاسی زیاتر بشۆم پارەی زیاترم دەست دەکەوێت. لەبەر ئەوەی بەپێی ژمارەی پاسەکان پارەم وەردەگرت زۆرم لە خۆم دەکرد و زۆر کارم دەکرد. ڕۆژی دوایی پشوو بوو بۆیە دەمگوت؛ "لە ڕۆژی پشوومدا تێر دەخەوم". تا کاتژمێر ١٠ یەک دنیا پاسم شت. ژمارەکەیم بە تەواوی بیر نایەت، بەڵام زۆربوون و پارەیەکی باشم وەرگرت و لە خاوەن کارەکەمم پرسی؛ "کاکە بەیانی پشوومە، کاتژمێر چەند بێم؟" گوتی؛ "هەر کاتژمێر ٦ وەرە". لێم پرسی؛ "دەکرێت زووتر بێم؟"، گوتی؛ "وەرە ئاسلان با بەیەکەوە چایەک بخۆینەوە". لە پەرداخێکی پلاستیکدا چای بۆ تێکردم. خۆی شەکری تێنەدەکرد،

بۆیە لە منیشی نەپرسی ئایا شەکر دەخۆم یان نا، منیش نەمتوانی داوای بکەم، تەنها دەمویست بزانم دەیەوێت چیم پێ بڵێت. چاکەم بۆ گەرمکردنەوەی دەستەکانم بەکاردەهێنا، دەست و قاچم بەستبووی. دیارە جزمەکانم کون بوون بۆیە ئەمڕۆ قاچم تەڕ بووبوو، لە تاو کارکردن هەر هەستیشم پێ نەکردبوو، کە جزمەکانم داکەند ئینجا پێمزانی. بە کورتی زۆر قورسبوو گوێ لە خاوەن کارەکە بگرم، بەڵام بێ ئارامبووم بۆ بیستنی ئەوەی دەیویست بیڵێت.

گوتی؛ "دەزانم دوو کار دەکەیت. نامەوێت زۆر درێژەی پێبدەم. هیچ بیرت لەوە کردوەتەوە ئەگەر ئەمە لە شوێنی کارەکەت ببیسترێت کێشەت بۆ دروست ناکات؟ ئەی هەر دەتەوێت زووتر بێیت بۆ سەر کار؟ دەزانم پێویستت بە پارەیە، بەڵام تێناگەم بۆ ئەم هەموو دەرد و خەمەت هەیە"!

ئەها لە پشتەوە چەقۆیەکم لێدرابوو، ئەوەی فێری کردم نابێت هەموو شتێک بۆ هەموو کەسێک باس بکەم... لەبەر ئەوەبوو نەمدەویست باسی هیچ بکەم. گوتم؛ "گوێی مەدەرێ کاکە. بە ڕاستی پێویستمە و دەمەوێت بێم بۆ ئێرە. ئەگەر لە شوێنی کارەکەشم ئەمە ببیسترێت تکات لێ دەکەم کە پێیان بڵێیت من خزمی تۆم، دواتر خۆم ڕێگەچارەیەکی بۆ دەدۆزمەوە و پێیان دەڵێم یارمەتی خزمی خۆم دەدەم. تۆ گوێ بە من مەدە، ئەوەندە بەسە بەیانی زوو بانگم بکەیت بۆسەر کار". گوتی؛ "نابێت، کاتژمێر ٦ دەست بە کار دەکەین و تۆش کاتژمێر ٦ وەرە. ئەگەر دەتەوێت

پێش کاتژمێر ٦ کار بکەیت ئەوا لە ڕۆژە پشووەکانتدا دەتنێرم بۆ شوێنێکی دیکە. بەیانی ناکرێت، بەڵام بۆ ڕۆژی پشووی داهاتووت دەتنێرم بۆ شوێنێکی دیکە و لەوێ ئۆتۆمبێلی ئاسایی بشۆ". زۆر دڵم خۆشبوو و یەکسەر گوتم؛ "باشە کاکە". پاشان گوتم؛ "من دەبێت بڕۆم" و بەرەو وێستگەی پاسەکە بەڕێکەوتم. دەڵێن؛ "هەتا بەندە بێچارە نەبێت خزر فریای ناکەوێت"... دەرگایەک دادەخرا و بەدوایدا یەکێکی دیکە دەکرایەوە. دەمزانی خودا لەگەڵمدایە و سوپاسگوزاریم دەکرد. ئەی ئەگەر هیچم نەدۆزیایەتەوە؟ ئەی ئەگەر هیچم پێنەکرایە؟ ئەو کاتە چیم دەکرد؟

لە هەمووشی خراپتر ئەگەر دوای ماوەیەک لە خۆمم بپرسیایە؛ "ئاسڵان هەموو شتێکت کرد کە لە دەستت دەهات؟" ئەمە لە هەموو شتێک خراپتر دەیڕوخاندم...

دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئەگەر هەموو شتێک خۆش و بێ کەموکورتی بوایە ئەوا تاقیکردنەوە لەم ژیانەدا نەدەبوو و نەتدەتوانی بەندایەتی خۆت بسەلمێنیت.

کاتژمێر ١١ گەیشتمەوە ماڵەوە. چوومە ژوورەوە و بە جۆرێک باوەشم بە دایکمدا کرد ناتوانم بۆتان باس بکەم... دەبوو باوەڕی پێبهێنم کە هەموو شتێک باش دەبێتەوە. دایکم لەبەر دەرگاکەدا بوو، بەخێرهاتنی کردم و گوتی؛ "بەخێربێتەوە کوڕم". چیتر من تاکە کەس بووم کە دایکە جوانەکەم چاوەڕێی دەکرد. لەبەر ڕووناکی مۆمدا گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد، کاتێک هەستم کرد قاچم بۆنێکی هێندە ناخۆشی کردووە بەهۆی کارکردنی زۆر

و تەڕبوونییەوە، بەپەلە هەستام و چووم قاچم بشۆم، ئاومان هەبوو، بەڵام وەک سەهۆڵ بوو، چەندین ڕۆژبوو گەرمکەرەکە کاری نەکردبوو...

کاتێک بەو ئاوە ساردە قاچم دەشت ئەمە هات بە میشکمدا؛ "ئاسلان کاتێک ئاوی گەرم لەم ماڵەدا هەبوو دەستنوێژت نەدەشت، بەڵام ئەوەتا ئێستا خودا ناچاری کردوویت بەو ئاوە ساردە قاچەکانت بشۆیت. ئەگەر لە دەستنوێژدا قاچەکانت نەشۆیت ئەوا خودا بە هەر شێوەیەک بێت هەر پێت دەشوات و پێت پاکدەکاتەوە".

لەوانەیە پێم بڵێیت؛ "تۆش لە هەموو شتێک وانەیەک دەدۆزیتەوە." بەڵام ئەگەر ئەو وانانەم نەدۆزیایەتەوە زۆر خراپتر دەبووم. ڕۆژی دواتر پشووم بوو و دەمویست لەگەڵ دایکم نانی بەیانی بخۆم، نانخواردنی ماڵەوەشم لە بیرکردبوو، تەنانەت نەمدەزانی دایکم هەر نان دەخوات یان نا. تەنها بە خاوەن دوکانەکەی هاوڕێمم گوتبوو هەموو ڕۆژێک سەموونێک بنێرێت بۆ ماڵمان. دەبوو بەیانیش قسە لەگەڵ کاکە أحمد-ی دەرگاوان بکەم، تا ئەگەر من لە ماڵ نەبووم و دایکم پێویستی بە هەر شتێکبوو یارمەتی بدات. هەموو ڕۆژێک هەتا دەهاتمەوە هەر دڵم لای دایکم بوو. شانسم باش نەبوو، بەڵام قەدەر کەمێک بەڕوومدا پێدەکەنی و دەستێکی بۆ درێژکردبووم تا خۆمی پێوە بگرمەوە...

وە تێگەیشتم لەوەی ئەگەر سەختییەکانی ژیان وەک دوژمن ببینین ئەوا ژیان سەختتریش دەبێت بۆمان. ئەگەر ئەو سەختیانە

وەک تاقیکردنەوەیەک ببینین ئەوا هەست بە بەهێزی خۆمان دەکەین و توانای زاڵبوونمان دەبێت بەسەر سەختییەکاندا. دایکمم بردە سەر جێگاکەی و چوومەوە ناو جێگاکەی خۆم. هەموو ڕۆژەکانی ژیانم وەک یەکبوون؛ کار، ماڵەوە، دایکم، من...

ژیانێکمان نەبوو شایەنی باسکردن بێت، لەگەڵ دەرد و خەمدا دەژیاین، بەڵام دەمزانی کە بەتەنها نیم، خودا لەگەڵمدابوو.

هێندەی نزایەک لێمەوە نزیکبوو...

وشەیەکی سێ پیتییە،
بەڵام دەتوانیت جێی هەموو شتێکی
تێدا بکەیتەوە و داوای هەموو شتێک
بکەیت پێی.
چەند شتێک جوانە، وانییە؟
ئەی وشەی جوان، باشبوو کە
هەیت، نزا...



**نزا بخەرە سەر نزا و کۆڵ مەدە.**
**شەرم لە داواکردنی هیچ شتێک مەکە.**
**دڵنیابە خودا ئەرەزووی بەخشین دەکات.**

ئەو نزایەم کرد کە هەموو شەوێک پێش خەوتن دەمکرد و گوتم: "خودایە تۆ لەگەڵمانیە." و پاشان خەوتم. ڕۆژی دواتر پشووم بوو، دەمویست تێر بخەوم، چونکە زۆر ماندوو بووم. بۆ بەیانی نزیکی کاتژمێر هەشت و نیو خەبەرم بوەوە. هەر نەمتوانی بخەومەوە. بیرم لەوە کردەوە کە نانی بەیانی بۆ دایکم ئامادە بکەم. کە بەفرگرەکەم کردەوە یەکسەر گوتم: "خۆزگە هەر نەمکردایەتەوە"، بە ڕقەوە سەیری ئەو بەفرگرەم کرد.

کەمێک لەو پەنیرە خورابوو کە تازە کڕیبووم، پێنج شەش دەنک زەیتونی تێدابوو، یەک تەماتەشم بینی، بەڵام نیوەی ڕزیبوو و سێ چوار هێلکەشی لێبوو، بەڵام پێویستم بە گاز بوو بۆ ئامادەکردنی هێلکەکان. بیرم کردەوە کە لە ناو ئاو گەرمکەرەکەدا بیانکوڵێنم بەڵام کارەباشمان نەبوو. لە ماوەی چەند چرکەیەکدا دنیایەک بیرۆکە بە مێشکمدا هات. بەهەرحاڵ، سێ چوار زەیتون، نیو تەماتە و کەمێک پەنیرم لەسەر مێزەکە دانا. هیچ ڕێگەیەک بە مێشکمدا نەهات بۆ لێنانی چا، کە سەیرم کرد سەمونیشمان نەمابوو. بەپەلە چووم بۆ دوکانەکە، تا شەربەت و سەمون بکڕم، بەڵام سمیتم بینی و دوو دانەم کڕی و چوومەوە بۆ ماڵەوە.

ماڵەکە زۆر ساردبوو. دایکم هەستابوو لە خەو و گوتی: "بە دەنگی دەرگاکەدا وامزانی چوویت بۆ سەر کار". گوتم: " نا نا... وەرە نانی بەیانی بخۆین".

هێندە جوان پێکەنی، سوێند بە خودا لەو کاتەدا خۆر هەڵهات و ماڵەکەی گەرمکردەوە. دوای چەندین ڕۆژ بۆیەکەم جار دایکم پێکەنی. باشبوو لەو کاتەدا هەستام لە خەو، خەوی چی خۆ بەو پێکەنینەی هەموو ماندوێتیم ڕۆیشت و نەما. نانی بەیانیم لەگەڵ دایکم خوارد، گفتوگۆم لەگەڵ کرد و بەیەکەوە خەیاڵمان کردەوە. دەمگوت: "بوەستە و ببینە بزانە بەیەکەوە چی دەکەین. دەتنێرم بۆ عەمرە دایکی شیرینم."

خۆ درۆم نەدەکرد، دەمویست ئەوە بکەم و نزام بۆ دەکرد و ئەوە تاکە ڕێبوو... لە ناخی دڵیشمەوە باوەڕم بە ڕاستی ئەو ڕێیە دەکرد. خەریکبوو تەواودەبووین لە نانخوارد کاتێک زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا. ئەو هاوڕێیەی بە باشی پارەکەی بەش نەکرد تەلەفۆنی کرد و یەکسەر هەڵم گرت و گوتم: "فەرموو کاکە" گوتی دووبارە کار هەیە و دەبێت بچین بۆ دیاری فرۆشتن و بڕەکەشی هەر هێندەی جاری پێشووە. منیش یەکسەر بە کورتی پێمگوت: "کاکە ناتوانم بۆ ئەو پارە کەمە خۆم بخەمە مەترسییەوە ببورە". ئەویش گوتی کە ئەم جارە زیاترم دەداتێ. گوتم: "باشە، لە ماڵەوەم وەرە هەڵمبگرە". گوتی سی خولەکی دیکە لەوێ دەبێت. گوتم: "باشە". چونکە منیش هەر سی خولەکم پێدەچوو تا خۆم دەشت و خۆم ئامادە دەکرد. بەڵام دوای ئەوەی تەلەفۆنەکەم

داخستەوە بیرمکەوتەوە کە ناتوانم خۆم بشۆم، چونکە ئاوەکە دەڵێی سەهۆڵە.

نزیکەی هەفتەیەکبوو خۆم نەشتبوو، هەستم بە پاکی نەدەکرد. ویستم بە دەسرِی تەڕ لەشم بسڕم و لە دایکمم پرسی ئایا دەسڕی تەڕمان هەیە، بەڵام ئەو دەسڕەی دایکم هێنای نیوەی وشکبووبوەوە. بە نیوە ناچلی لەشمم سڕی و خۆم ئامادە کرد. کاتێک چاوەڕێی هاوڕێکەم بووم، بە دایکمم دەگوت کە دەچم بۆ سەر کار و پارە پەیدا دەکەم، کۆتایی بە خەم و خەفەتەکانی دەهێنم و ژیانێکی خۆشی بۆ دابین دەکەم. بەردەوام ئەمەم دووبارە دەکردەوە، بەڵام خۆشم باوەڕم پێی نەدەکرد. وامدەزانی ئەمڕۆ زۆر خۆش دەبێت، بەڵام بێئاگابووم لەو شتە خراپانەی بەڕێوەبوون. هات و هەڵیگرتم و چووین بۆ دوکانی دیارییەکان...

**Tanya Haji** | تەنیاحاجی

public channel



**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

**لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf**
**بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

ژیان هەموو کاتێک سوپرایزێکی پێیە،
کەس نازانێ چیت بۆ دەردەچێت
لەم سوپرایزە.
بە درێژایی تەمەنیشت
ناتوانیت بیزانیت!



## ئارامگرتن یان یاخیبوون؟

دیارییەکانم هەڵگرت و بەرەو دوکانی دیارییەکان ڕۆیشتم. کاتێک چومە ژوورەوە بەڕێوەبەرێکم بینی کە لە بازارەکە دەهاتە دەرەوە. بەڕێوەبەرێکبوو هەر لە بوارەکەی ئێمەدا کاری دەکرد. بە ترسەوە بەرەو سوچێک ڕۆیشتم و بە خۆمم دەگوت؛ "تۆبڵێی منی بینیبێت؟" ئەو مەترسییەم هاتەوە بیر کە باسیان دەکرد و لە ناکاو ترسام. بەڕێوەبەرەکە بەرەو ڕووم هات و گوتی؛ "ئاسلان، چی دەکەیت لێرە؟" بە ترس و دەم تەتەڵکردنەوە گوتم؛ "هاتوم بۆ بازاڕکردن".

ئەها دەڵێن وشەکان لە قورگیدا گیر دەخوات، منیش ڕێک وام لێ هاتبوو. ئەویش سەری لەم هەڵسوکەوتەم سورمابوو و بە گومانەوە سەیری دەکردم. ڕاستەوخۆ پرسی؛ "ئەو جانتایەی دەستت چییە؟"لە کاتێکدا کە دەبوو بڵێم؛ "پەیوەندی بە ئێوەوە نییە" وەڵامێکم دایەوە لەبارەی کارەکەمەوە. گوتی؛ "باشە، ئاگات لە خۆتبێت." و پشتی تێکردم و ڕۆیشت. لە سوچێکدا خۆم شاردەوە و کەمێک سەیرم کرد تا تەواو دوورکەوتەوە. دوای ئەوەی ئەو ڕۆیشت یەکسەر تەلەفۆنەکەمم دەرهێنا و پەیوەندیم بەو هاوڕێیەمەوە کرد کە منی هێنابوو بۆ ئەوێ و باسی دۆخەکەم

بۆ کرد. ئەویش گوتی؛ "ئارامبەرەوە، هیچ نابێت. بڕۆ دیارییەکانی بەرێ و پارەکە وەربگرە. من لێرەم، مەترسە".

ناخم ئاسوودە بوو. چووم بۆ دووکانی دیارییەکە، دیارییەکانمدایە، پارەکەم وەرگرت و هاتمە دەرەوە. وا دیاربوو هیچ کێشەیەک نەبووبێت، هەر لە خۆڕایی ترسابووم، بەڵام هەر بەپەلە بەرەو ئۆتۆمبێلەکە ڕۆیشتم، خۆم هەڵدایە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، ئەها لە فلیمەکاندا خۆیان هەڵدەدەنە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە و دەڵێن؛ "بڕۆ بڕۆ پێ بە بەنزیندا بنێ" منیش ڕێک وامکرد و گوتم؛ "دەی کاکە دەی با بڕۆین خێرا..." تێنەگەیشت چی بووە، بەڵام خێرا پێی بە بەنزیندا نا. پرسی؛ "چی بوو؟" گوتم؛ "نازانم بەڵام ئەو ژنە گومانی لێکردم". گوتی؛ "گوێی مەدەرێ، خەمت نەبێ هیچ نابێت" و گوتی؛ "کوا پارەکە؟" پارەکەم دەرهێنا و پێمدا، ئەویش بەشێکی لە پارەکە پێدام. ئەم جارە کەمێک زیاتر بوو لە جاری پێشوو، بەڵام هەر کەمتربوو لەوەی هاوڕێکەی دیکەم پێیدەدام، واتە دیسان زۆر کەمی پێدام و نەمتوانی هیچ بڵێم، تەنها لە دڵی خۆمدا گوتم؛ "ئەمە کۆتا کارمە لەگەڵ ئەم پیاوەدا". بەڵام نەدەکرا کۆتا کارم بێت، چونکە پێویستم بوو. لەم کاتانەدا مرۆڤ وا هەست دەکات بەکاردەهێنرێت، یانیش من وا هەستم دەکرد لەبەر ئەوەی زۆر پێویستم بوو، نازانم.

هەرچەندە ژیانێکی تاڵیشت هەبێت،
و تورەیی باڵ بەسەر ڕۆحتدا بکێشێت،
بەڵام ئەو دڵشکاوی و خەمەی لە ناختدایە
هەواڵبەری چاکیتە،
چونکە خەمخواردن کاری مرۆڤە چاکەکانە.



منی گەیاندەوە ماڵەوە و لە ڕێگا زۆر قسەمان نەکرد. بەتەمابووم کە گەیشتمەوە ماڵەوە پارەکە بژێرم و مووچەکەشمی بخەمە سەر و پلانێک دابنێم. پارەی کارەبا، گازی سروشتی، کرێ و قیستی ئەو کەلوپەلانەی دایکم بۆ خوشکەکەمی کڕیبوو. واتە بە کورتی دەبوو زیاتر و زیاتر کار بکەم. کە ڕۆیشتمەوە دایکم لە ماڵ نەبوو، بەپەلە پەیوەندیم پێوە کرد. گوتی کە لە ماڵی دراوسێیەکمانە لە گەڕەکە کۆنەکەمان و دەمەو ئێوارە دەگەڕێتەوە، بەڵام لە ماڵ پاککردنەوەبوو و هەروەک گوتم، منیش ئەمەم نەدەزانی، زۆر دواتر پێمزانی. لە جیاتی ئەوەی بە تەنها لە ماڵەوە دانیشم، چووم بۆ دووکانەکە. کاتێک لە دووکانەکە دانیشتبووم زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا. خاوەن دوکانی دیارییەکان پەیوەندی کرد...

دوای ئەو پەیوەندییە هەموو شتێک گۆڕا. دەزانیت چۆن گۆڕا؟ خراپتربوو، هەموو شتێک خراپتر و خراپتر بوو... کاتێک دەمگوت؛ "تۆبڵێی لەمە خراپتر چی ڕووبدات؟" شتی خراپتریشم بەسەر هات. خاوەن دوکانی دیارییەکان گوتی کە یەک دوو بەڕێوەبەری فرۆشگاکە هاتوون و پرسیاری منیان لێ کردووە.

فریانەکەوتم بڵێم؛ "هیچت پێ گوتن؟" خۆی گوتی؛ "من هیچم پێ نەگوتن، بەڵام دیارە چاوت بە کەسێک کەوتووە و دوات

کەوتووە. دواتریش سەیری ئێرەی کردووە و تۆی لێرە بینیوە. بۆیە گوتم کە ناتناسم، بەڵام هەر باوەڕیان پێ نەکردم." و پاشان تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

دونیا بەسەرمدا ڕوخا. نەمدەزانی چی بکەم. ترس و شڵەژاوی باڵی بەسەر هەموو جەستەمدا گرت. نەشمدەزانی لە چی دەترسم. خاوەن دوکانەکەی هاوڕێم خێرا پرسی؛ "باشیت؟ ها کەمێک ئاو بخۆرەوە" و پەرداخێک ئاوی دامێ. ڕەنگم پێوە نەمابوو. وایزانیبوو شەکرەم دابەزیوە بۆیە پارچەیەک چوکولاتەی پێدام، نازانم ئەو ساتانەم بە باشی بیر نایەت. لەو ساتەدا ژیان بۆماوەی دە خولەکێک وەستا لەلام.

ئەم ماوەیە، قەلەڕەشەکانی ناو مێشکم هەر ئاوازی مردن دەخوێنن...

پێویستم بە کاتبوو تا بتوانم بە باشی بیر بکەمەوە، بەڵام ژیان خۆشبێت هەر مەجالی نەدەدام...

بە مێشکمدا هات پەیوەندی بکەم بە یاریدەدەری بەڕێوەبەرە باشەکەی کە پارەکەی وەک بەشی برا گەورە و برا بچووک بەشکردبوو. بەپەلە پەیوەندیم پێوە کرد و بە وردی باسی هەموو ڕووداوەکەم بۆ کرد. پێی گوتم ئارام ببمەوە و ئێستا دێت بۆلام، و پرسی کە لە کوێم. کە بەڕێکەوت تەلەفۆنەکەمان داخستەوە و پەیوەندیم بەو یاریدەدەری بەڕێوەبەرەشەوە کرد کە بەیانی بەیەکەوە چووین بۆ فرۆشتنی دیارییەکان، ڕووداوەکانم بۆ ئەویش باسکرد. ئەویشت ویستی بێت بۆلام، وەک ئەوەی ئەویش

گڕی گرتبێت، زۆر شڵەژا لە پەیوەندییەکەدا. سەیربوو بەلامەوە، بە باشی قسەی لەگەڵ دەکردم و دەیگوت؛ "براکەم با بێم بۆلات..." لە کاتی ئاساییدا منی وەک کرێکاری خۆی دەبینی، بەڵام لە ناکاو بووبووم بە برای. پێمگوت کە نەیەت بۆلام، چونکە چاوم بە کەسێکی دیکە دەکەوێت. پرسی؛ "ئەویش هەمان کار دەکات؟" بێ ئەوەی ناوەکەی بڵێم گوتم؛ "بەڵێ" و خۆی یەکسەر ناوەکەی گوت، تومەس ئاگایان لەیەک بووە و من نەمزانیوە، بەڵام هەر گوتم؛ "نا ئەو نییە" و تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

کاکە باشەکەی تر هات و منی هەڵگرت. دوای ئەوەی منی هەڵگرت یاریدەدەرەکەی تر پەیوەندی پێوە کرد و ئەم گوتی؛ "دەڕۆین بۆ فلان شوێن تۆش وەرە" یەکسەر گوتم؛ "ئەویش دێت؟ گوتی؛ "بەڵێ، بانگم کرد تا بەیەکەوە باسی هەموو شتێک بکەین." و بە ئارامی گوتی؛ "مەترسە، هیچ نابێت". بەڵام من وەک ماسی لە ئاو دەرهاتوو پەلەقاژەم دەکرد و لە ناخەوە دەلەرزیم. هەستێک لە ناخمدا دەیگوت کارەکەم لەدەست دەدەم. لە کاتێکدا کە هەموو شتێک باشبوو و پارەم پەیدا دەکرد. لە دوو شوێن کارم دەکرد و ئەم دیاریانەشم دەفرۆشت و پارەی زیاترم دەست دەکەوت، بەڵام ئەمانە ڕوویدا. ئێستا زانیم کە مەترسی چییە، بەڵام هەرگیز نییەت و بیرۆکەی خراپم نەبوو.

تاکە ئامانجم پارە پەیداکردن و چاودێری کردنی دایکم بوو. یاریدەدەرەکەی تریش هات. وەک پۆلیسی باش و پۆلیسی خراپ بوون. تەنانەت نەمدەتوانی بزانم کە باشەکە بەڕاستی باشە یان

نا. قسەمان دەکرد، سیناریۆمان دەنووسی و دەیانگوت؛ "لەوانەیە ئەوە ببێت یان ئەمە ببێت... کە چوویتەوە بۆ فرۆشگاکە پرسیارت لێ دەکەن، ئەگەر هیچ نەڵێیت ئەوا هیچیان پێ ناکرێت". هاوڕێ خراپەکە، واتا ئەوەی هیچ بیری لە من نەدەکردەوە و هەر بیری لە خۆی دەکردەوە گوتی؛ "سەیرکە براکەم، من منداڵم هەیە. تەمەنم تێپەڕیوە و ئێستا کاری ترم پێ ناکرێت. نەکەی ناوم بڵێیت..." ئەوەی تریشیان وەک براگەورەیەک قسەی لەگەڵ دەکردم و دەیگوت؛ "مەترسە، ئارامبەرەوە. ئەگەر زۆریان لێکردیت هەموو شتێک بڵێ و خۆت مەکە بە قوربانی". من لە نێوانیاندا مابوومەوە و تۆقیبووم. نەمزانیبوو ئەم کارە هێندە مەترسیدارە. خۆ ئەوانەی فرۆشتم دیاریبوون کە بۆ ئەم کەسانە خۆیان هاتبوو، ئیتر بۆچی هێندە ترسابوون، یان بۆچی لەسەر ئەمە لێپێچینەوە لە من دەکرا؟ نازانم...

هەر لێم مەپرسن کە ئەو ڕۆژەم چۆن تێپەڕی. نە چووم بۆ پاس شتن نە هیچیتر، چاوەڕێی دایکمم کرد بێتەوە بۆماڵەوە. لەگەڵ دایکمدا دانیشتم و گفتوگۆمان کرد وەک هەموو ڕۆژێکیتر و ئومێدم پێدا. دواتر چوومە سەر جێگاکەم و خەوتم. بە ڕاستی دەمویست بخەوم و زوو بەیانی بێت تا ئەو ترسەی ناخم بڕەوێتەوە. نزام دەکرد تا هیچ شتێک نەبێت، تەنها نزام دەکرد...

بەیانی یەکەسەر خۆم گۆڕی و چووم بۆ سەر کارەکەم. نەمدەزانی کە لە شوێنی کارەکەم چی چاوەڕێمە. بەڕێوەبەری ناوچەکە، یەک دوو بەڕێوەبەری دیکە و ئەو بەڕێوەبەرەی

منی لە دووکانی دیارییەکان بینیبوو لەوێبوون. وەک ئەوەی شمشێرەکانیان هەڵگرتبێت و لەبەردەم دەرگاکەدا بۆ من وەستابن.

منیش بە ترسەوە بەلایاندا ڕۆیشتم و گوتم؛ "سڵاو" و چوومە ژوورەوە، پاشان دەنگێک گوتی؛ "ئاسڵان ئەتوانیت بێیت؟" ئەوە بەڕێوەبەری ناوچەکە بوو. ئاوڕم دایەوە و گوتم؛ "فەرموو بەڕێوەبەر".

بانگی کردم بۆلای خۆی و گوتی دەبێت قسە بکەین، بەڵام ناکرێت لە فرۆشگاکەدا ئەو قسانە بکەین. سەیری کافتریاکەی کرد و گوتی؛ "با هەمووومان بەیەکەوە لە کافتریاکە چایەک بخۆینەوە". بێگومان نەمتوانی بڵێم "نەخێر". بەرەو کافتریاکە ڕۆیشتین. هەموو کەسانی ناو فرۆشگاکە سەیری ئێمەیان دەکرد، هەموویان تێگەیشتبوون کە شتێک بووە، بەس من لەو شتە تێنەگەیشتبووم. هەتا ئەو کاتەش هەر تێنەگەیشتبووم چی دەبێت. بەیەکەوە چووین بۆ کافتریاکە و داوای چایان کرد و دانیشتین.

بەڕێوەبەری فرۆشگاکەی خۆمان دەستی بە قسە کرد و گوتی؛ "سەیرکە ئاسڵان، ئێمە تۆمان خۆشدەوێت، کەسێکی بەڕێزیت. ڕاستە کەمێک شێتۆکەیت، بەڵام کارەکتەر و فرۆشتنەکانت زۆر گرنگن بۆ ئێمە". دوای ئەم ڕستە جوانانە پرسی؛ "دوێنێ چیت کرد؟" منیش گوتم دوێنێ چووم بۆ بازاڕکردن و ئاماژەم بۆ بەڕێوەبەرەکەیتر کرد و گوتم کە ئەویشم بینیوە، بەڵام کاتێک ئەمانەم دەگوت زۆر شڵەژابووم، ئەوانیش هەستیان پێکردبوو و نەمدەزانی چی بکەم. ئەها کاتێک کارێکی زۆر خراپ دەکەیت

کەلوپەل یان دەستکێشی کەسێکی دیکە لە شوێنی ڕووداوەکە بەجێ دەهێڵێت تا بەسەر ئەودا بێتەوە، نازانم ئیتر لە فلیمەکاندا ئاوا بینیومە... ڕێک ئاوا تاوانەکە خرابووە ملی من و منیش نەمدەزانی چی بکەم. دەمویست باسی هەمووی بکەم، بەڵام ئەها یاریدەدەری بەڕێوەبەرە خراپەکە گوتی؛ "منداڵم هەیە، تەمەنم تێپەڕیوە، من تیادەچم." ئەو گوتانەی هەر لە مێشکمدابوون. دووبارە هەر نییەتم باشبوو و دەمگوت؛ "ڕاستە منیش لە دۆخێکی سەختدام بەڵام من بیست و دوو ساڵم. ئەگەر دەریش بکرێم یەک دنیا کاریتر هەیە کە دەتوانم بیکەم".

بەڕێوەبەری ناوچەکە هاتە ناو قسەکانەوە و هاواری کرد و گوتی؛ "ئەگەر باسی دوێنێمان بۆ نەکەیت ئەوا سەرت دەشکێنم و پاشانیش دەرت دەکەم لەسەر کارەکەت!" منیش بە توندی وەڵامی ئەم هەڵچونەی ئەوم دایەوە و گوتم؛ "نەتانبیست کە چیم گوت؟ تەنها ئەوە بوو هیچترم نییە بۆ باسکردن". کە من وام گوت ئەو بەڕێوەبەرەی دوێنێ دوامکەوتبوو گوتی؛ "سەیرکە ئاسلان، بە ئارامی بیر بکەرەوە. دڵنیاین کە تۆ ئەوانەت لە کەسیتر وەرگرتووە و فرۆشتووتە، ئەمە شتێک نییە بە تۆ بکرێت، ئێمەش ئەقڵ و مەنتقمان هەیە. دەزانین تۆش بۆ پارە پەیدا کردن ئەمەت کردووە و هیچ نییەتێکی خراپت نەبووە. تەنها پێمان بڵێ کێ ئەم کارەی کردووە و با بتکەین بە سەرۆکی فرۆشگاکە. هەم پلەت بەرز دەبێتەوە هەم مووچەکەت زیاد دەکات، هەم با ئەو کاسانەی

ئەم کارە دەکەن لە نێوانماندا نەمێنن". قسەکانی هێندە مەنتقی بوون، کێ ئەمەی ناوێت، وانییە؟

هەم مووچەکەم زیادی دەکرد، هەم پلەم بەرزدەبوەوە، ئەو کەسەی خراپەی بەرامبەر کردم سزای خۆی وەردەگرت، بەڵام دیسان ویژدانم ڕێگەی پێنەدام. گوتم: "هەر ئەوەندەم هەیە بۆ باسکردن" و گوتم: دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ فرۆشگاکە و هیچیترم نییە بۆ باسکرد. بەڕێوەبەری ناوچەکە وازی لە توڕەبوون هێنا و گوتی: "تا کاتژمێر دوو کاتت هەیە. ئەگەر نەیڵێیت ئەوا من بەرپرس نیم لە ڕووداوەکان" و هەستا ڕۆیشت. ئەو بەڕێوەبەرەش کە منی بینیبوو گوتی: "بەڕای من قسە بکەیت باشترە ئەگەر نا تیادەچیت". بەڕێوەبەرەکەی خۆشم گوتی: "بڕۆرەوە بۆ فرۆشگا لەوێ قسە دەکەین" و منی ناردەوە بۆ فرۆشگاکە. کە گەڕامەوە بۆ فرۆشگاکە هەموو کەس دەیگوت: "چی بووە ئاسلان؟" حەزم دەکرد هاوار بەسەر هەموو کەسێکدا بکەم و بڵێمگ "هیچ نییە دوور بکەونەوە لێم". کە دەڵێم دووربکەونەوە لێم مەبەستم ئەوەیە با ئێوەش تیا نەچن، چونکە نامەوێت بە هۆی منەوە گومان لە کەس بکەن.

ئەرێ من چیم کردبوو! خەریکبوو تێکدەچووم، بۆچی ئەم هەموو مەترسیەی تێدابوو.

دەیانگوت: "دەزانین بۆ پارە پەیداکردن ئەمەت کردووە." ئێ مادەم دەزانن بۆچی هێرش دەکەنە سەر من، بۆچی؟

بەڕێوەبەر هاتەوە، چووە ژوورەکەی خۆی و بانگی منی کرد.

هەر کە چوومە ژوورەوە دەستی بە قسە کرد. گوتی؛ "با ئێستا واز لە بابەتی بەڕێوەبەر و کارمەند بهێنین، با وەک خوشکێکی گەورە و برایەکی بچووک قسە بکەین. دەزانم کە کێشەت هەیە. دەکرێت کێشەکان هەڵە بە مرۆڤ بکەن، مرۆڤ لەو ساتەدا ناتوانێت چاکە و خراپە لەیەک جیا بکاتەوە، پێویستی بە هەرچییەک بێت ئەوە بە ڕاست دەزانێت و ئەوە دەکات، نازانێت کە هەڵەیە. ئەم کارەی تۆش زۆر هەڵەیە. دەزانین کە لە کەسێکی ترت وەرگرتووە و فرۆشتووتەتەوە..." لەوێدا قسەکانیم بڕی و ڕێک چوومە بابەتەکەوە و گوتم؛ "چیم کردووە تا دەڵێن هەڵەیە؟ لە هیچ تێناگەم". خۆم گێل دەکرد، بەڵام زۆر بە ئاسانی لێی تێگەیشتبووم. چونکە پێشتر نەکەوتبوومە دۆخێکی ئاواوە و نەمدەزانی بەباشی خۆم گێل بکەم، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات فێری خۆ گێلکردنیش بووم، چونکە ژیان مرۆڤ فێری گێلێتیش دەکات. هاواری کرد و گوتی؛ "قسەم پێ مەبڕە! سەیرکە دووبارەی دەکەمەوە، وەک خوشکێکی گەورە قسەت لەگەڵ دەکەم. ئێستا پێت دەڵێم کە چی ڕوودەدات ئەگەر قسە نەکەیت و تۆش دواتر بڕیاری خۆت بدە." و بەم شێوەیە دەستی بە قسەکانی کرد:

"ئەگەر هەتا نیوەڕۆ ناوی کەسێک نەڵێیت، ئیمەیڵێک دێت بۆ فرۆشگاکەمان و هەموو فرۆشگاکانی تر، هەر بە فرۆشگاکانی ئێمەشەوە ناوەستێت، بەڵکو بۆ هەموو بەرپرسی ناوچەی هەموو مارکەکانی تر و هەموو کەسێکی ناو ئەم بوارە دەڕوات. واتە ئەو

ئیمەیڵە دەڕوات بۆ هەموو ئەو کەسانەی ناو ئەم کەرتەی کە بە مێشکتدا دێت. لە ئیمەیڵەکەدا ئەمە دەنووسرێت: بەهۆی ئەو تاوانی دزیکردنەی ئەنجامی داوە، داوا لە ئاسلان ک. دەکەین دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە." لە ناکاو چاوەکانم پڕ بوو و دەستم کرد بە هاوارکردن و گوتم؛ "دزی چی، ئەوە باسی چی دەکەن!"

ئەمە چ تاقیکردنەوەیەک بوو؟ چۆن بێ زەرە و زیان لەم تاقیکردنەوە دەردەچووم؟ ئەمە چ مەترسییەک بوو وا ئیستا پێم دەڵێن دز؟ لە کاتێکدا کە خۆیان دەڵێن؛ "تۆ نەتکردووە" چۆن دەتوانن ئاوام پێ بڵێن؟ دەبوو خێرا بێمەوە سەر خۆم و بە باشی بیر بکەمەوە. وام دەزانی هەرگیز کاری واناکەن و تەنها بۆ هاندانی من ئەم قسانە دەکەن، چونکە ئەوانیش دەیانزانی من کارێکی لەو شێوەیەم نەکردووە و ناشیکەم، تەنانت بەڵگەیەکیشیان پێ نەبوو. ئەوانەی فرۆشتبووم خۆیان دیاریبوون، نابێک شتێک بدزرێت تا ناوی بنرێت دزی؟

وامدەزانی گاڵتە دەکەن. گوتم؛ "چی دەکەن بیکەن، من شتی وام نەکردووە. ئەگەر دەرم دەکەن لەسەر کارەکەم دەرم بکەن، من هیچم نەکردووە". دەرگاکەم بە توندی دایەوە بەیەکدا و چوومە دەرەوە، لەبەردەم دەرگاکەدا هاوڕێکانی ناو فرۆشگاکەم چاوەڕێیان دەکردم. هەموو کەسێکی ناو فرۆشگاکە منی خۆشدەویست. هەر دەیانگوت؛ "چی بووە دە باسی بکە". بەڵام هیچم نەبوو بۆ باسکردن. هەر دەمگوت؛ "پلانم بۆ دادەنێن و من لەکەدار دەکەن". هەموو کەس بە سەرسوڕمانەوە

سەیری دەکردم، کەس لە هیچ تێنەگەیشتبوو. دۆخی نا ئاسایی ڕاگەیەندرابوو. چیتر کەس سەلامیشی لەیەک نەدەکرد لە ناو فرۆشگاکەدا، هەموو کەس تاسابوو و بە بێدەنگی کارەکانی خۆی دەکرد. منیش لە سوچێکدا بووم و تەنها بیرم دەکردەوە. بە ناوی چوون بۆ دەستشۆرەوە چوومە دەرەوە و ویستم پەیوەندی بە یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکانەوە بکەم، تەنها ئەوە بە مێشکمدا هات، بەڵام نەمدەتوانی پەیوەندی بەوانیشەوە بکەم. هێندە ترسابووم وامدەزانی ئەمە دەبێتە بەڵگە لە دژی من.

ئەمە یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا بکەومە دۆخێکی لەم شێوەیەوە. دونیا بەسەرمدا ڕوخابوو و منیش لە ژێریدا گیرمخواردبوو. نە دەمتوانی بێمەوە سەر خۆم و نە دەمتوانی خاڵێکی بەهێز لە خۆمدا بدۆزمەوە. نەمدەتوانی ڕزگارم ببێت و هەر لە ژێریدا پاندەبوومەوە. کات تێدەپەڕی و منیش بە ترس و دڵەڕاوکێوە بۆخۆم چاوەڕێم دەکرد بزانم چی ڕوودەدات، و نەمدەتوانی هیچ کارێک بکەم. تەواو بێچارەبووم.

بەڕێوەبەر بەرەو من هات و گوتی؛ "ئەمە بڕیاری کۆتاییتە؟" تەلەفۆنەکەی بە گوێیەوە بوو و کراوەبوو و منیش گوتم؛ "چی کۆتا بڕیارمە؟ تێنەگەیشتم". گوتی؛ "ناوەکە ناڵێیت، خۆت لەناودەبەیت؟" منیش گوتم؛ "ناو و شت نازانم، هێشتا تێنەگەیشتووم باسی چی دەکەن". پێش ئەوەی وەڵامی من بداتەوە وەڵامی تەلەفۆنەکەیدایەوە و گوتی؛ "بەڕێوەبەر، چی دەکەن بیکەن، هێشتا سوورە لەسەر بڕیارەکەی." و تەلەفۆنەکەی داخستەوە. هەر کە تەلەفۆنەکەی

داخستەوە بەرەو کۆمپیوتەرەکەی ڕۆیشت، منیش هاوارم بۆ سەرۆکەکە کرد و گوتم؛ "من دەچم بۆ دەستشۆر"، بەڕێوەبەر هاواری کرد و گوتی؛ "نا نا وەرە بۆ ئێرە. وەرە سەیری ئیمەیلەکە بکە". لە کۆمپیوتەرەکە نزیکبوومەوە و بە تیلەی چاو سەیرێکم کرد و خوێندمەوە.

لە ناونیشانەکەیدا بە گەورەیی نووسرابوو "بۆ ئاگاداری هەموو فرۆشگا و بازرگانەکان. زۆر گرنگە"...

لە دڵی خۆمدا نزام دەکرد ناوەڕۆکەکەی بەتاڵبێت، تەنها یەک ڕستەی تێدا نووسرابوو، بەڵام دەبوو بە تەواوی نزیک ببمەوە تا بتوانم بیخوێنمەوە. پێش ئەوەی من نزیک ببمەوە بەڕێوەبەر گوتی؛ "بوەستە بوەستە با من بە دەنگی بەرز بیخوێنمەوە تا هەموو کەس گوێی لێبێت"؛

"بەهۆی ئەو تاوانی دزیکردنەی ئەنجامی داوە، داوا لە کارمەندی فرۆشگاکەمان، ئاسلان ک. دەکەین دەست لە کارەکەی بکێشێتەوە".

دونیا بەسەرمدا ڕوخا، کارەکەمم هەر بە خەیاڵدا نەدەهات، نووسرابوو "دزی" بەمنیان دەگوت "دز"، ئەمە چۆن دەبێت؟ چۆن دەکرێت ئەمە ئەنجامی ئەو کارەبێت؟ من چی بکەم، چی بە دایک و باوکم بڵێم؟ خۆشم نەمدەتوانی وەڵامی خۆم بدەمەوە. لەکەیەکی زۆر گەورەیان خستبووە سەر ناوم. ئەها پێشتر گوتم؛ "وەک ئەوە وابوو تەشتێک ئاوی کوڵهاتوو بڕێژن بەسەرمدا"، وەڵاهی ئەم جارە تێزابیان ڕشت بەسەرمدا، گوێم لە چزە چزی سووتانم

بوو. کاتێک من بە چاوی پڕ فرمێسکەوە بیرم لەمانە دەکردەوە، بەڕێوەبەر نەوەستا و وێنەیەکی پەڕاوی دەستلەکارکیشانەوەی ڕاکێشا و خستییە بەردەمم و گوتی؛ "واژۆی بکە". بێ ئەوەی بیخوێنمەوە واژۆم کرد. گوتم؛ "خوا بەڵاتان بۆ بنێرێت، وادەزانن خودا ئەم کارەتان نابینێت؟" فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە و قەمسەڵەکەمم هەڵگرت و چوومە دەرەوە لە فرۆشگاکە.

کەس نەیتوانیبوو بەدوامدابێت لە ترسدا. کەس نەیدەویست گومانی لێ بکرێت. لەکەیەکی زۆر گەورەیان خستبووە سەر ناوم. کە لە مۆڵەکە دەرچووم و کورسییەکم بینی لە سووچێکدا و هەر کە لەسەری دانیشتم دەستم کرد بە گریان. شەرمم لە کەس نەدەکرد و بە هەنسکی قوڵەوە دەگریام. هێندە گریام تا هەموو خەمەکانم هەڵڕشت و ئارامبوومەوە. ئەوانەی بەسەرمدا دەهات وەک ئەشکەنجە بوون بۆم، بەڵام چیتر لەوە نەدەچوو لە ژێر ئەشکەنجەدابم، بەڵکو لەشم تەواو بێ هەستبووبوو.

پیاوێکی تەمەن چل ساڵان هاتە لامەوە، پرسی؛ "کوڕی گەنج، باشیت؟" لەویش تووڕە بووم و گوتم؛ "وازم لێ بێنن". ئەو لە باشی خۆی پرسیاری لێکردبووم، بەڵام لەو کاتەدا هیچ شتێکم بە باش نەدەزانی. دوای ئەوەی گریانەکەم وەستا خێرا تەلەفۆنەکەم دەرهێنا و پەیوەندیم بە یاریدەدەری بەڕێوەبەرە باشەکەوە کرد. گوتی؛ "ئیمەیڵەکەم خوێندەوە، لە خۆڕایی خۆتت لەناوبرد، خۆزگە ناوی یەکێکمانت بگوتایە. لە کوێیت؟ باشیت؟ ئێوارە دوای کار دێم بۆلات و قسە دەکەین". دوای ئەو تەلەفۆنم بۆ یاریدەدەری

بەڕێوەبەرە خراپەکەش کرد، وەڵامی نەدامەوە. هەر پەیوەندیم پێوە کرد و هەر وەڵامی نەدامەوە...

لە دڵی خۆمدا وەک شەستە باران جنێوم بەسەر ئەو هاوڕێیەدا دەباراند، قسەی زۆر ڕەقم پێ دەگوت. بە جۆرێک هاوارم دەکرد لە دڵمدا، ئەگەر ئێستا لە بەرامبەرمدا بوایە پێویستی نەدەکرد هیچ بڵێم، خۆی لە چاوەکانمەوە ئەو ئاگرەی ناخمی دەبینی و بێ ئاوڕدانەوە ڕایدەکرد. کەسێکی دڵ باشبووم، بەڵام کەسێکی ڕەقبووم و هەموو ساتێک دەکرا هەموو شتێک بکەم. هیچ کاتێک دیار نییە کە من چی دەکەم. لە ناکاو خاوەن دوکانی دیارییەکە هاتەوە بیرم. بەپەلە هەستام و بە خێرایی چووم بۆ وێستگەی پاسەکە و ڕێک بەرەو دوکانی دیارییەکە ڕۆیشتم. تازە خستبومە مێشکەمەوە کە ئەوێ بڕوخێنم بەسەریدا. لە کۆتاییدا گەیشتمە دوکانی دیارییەکە... ویستم هەر کە چوومە ژوورەوە دەست بکەم بە هاوارکردن بەسەریدا، بەڵام کڕیاری لێبوو. بۆیە منیش چوومە سووچێکەوە و دانیشتم، چاوەڕێی ڕۆیشتنی کڕیارەکەم کرد. پێی گوتم: "بەخێربێیت ئاسلان". بەڵام بە هەڵسوکەوتەکانمدا تێگەیشتبوو کە هیچ بەخێرنەهاتبووم. هەر کە کڕیارەکە چووە دەرەوە پێی گوتم: "ئارامبەرەوە، نەکەی هاوار بکەی، ئێرە شوێنی ڕزقی منە".

دیسان لایەنە باشەکەمی چالاک کردەوە، بیری خستمەوە کە نابێت لە شوێنی ڕزقدا هەڵسوکەوتی نەشیاو بکەم. منیش بە توڕەییەوە گوتم: "چۆن ئاوا من لەناودەبەیت؟ من چیم لێ

کردوویت کاکە؟" ئەویش گوتی؛ "من هەرگیز ناوی تۆم پێ نەگوتوون، پێشیان نالێم. تۆیان لێرە بینیوە. دەبوو تۆ ئاگاداری ئەمە بیت نەک من، خۆ من بەڕێوەبەرەکان ناناسم، تکایە تاوانەکە مەخەرە ملی من ئاسلان". بەڵام ئەم قسانە منی ئارام نەکردەوە و هەستامە سەرپێ و گوتم؛ "خودا بەڵات بۆ بنێرێت! إن شاء الله لەناودەچیت، تیادەچیت و ئیفلاس دەکەیت، پیاوێکی هاوتەمەنی باوکمیت، بۆیە ناتوانم دەستت لێ بەرز بکەمەوە، بەڵام إن شاء الله نزاکانم گیرا دەبێت!" و چوومە دەرەوە و ڕۆیشتم. کە لەوێ چوومە دەر زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا. ئەو کەسە پەیوەندی دەکرد کە نە من و نە ئێوە خۆشمان ناوێت، ئەوەی وەڵامی پەیوەندییەکانمی نەدەدایەوە.

بە ڕەقی و بە هاوارەوە وەڵامم دایەوە و یەکسەر گوتم؛ "ئەوە بۆ وەڵامی پەیوەندییەکانم نادەیتەوە؟" ئەویش بە ڕەقی وەڵامیدایەوە و گوتی؛ "چییە ئەوە، خێرە؟ ئارامبەرەوە".

گوایە لە ماڵەوەیە و ئاگای لە هیچ نییە. منیش گێلم باوەڕ بەمانە دەکەم، وانییە؟ یەکێک نەزانێ ئیمەیڵەکە بۆ تەلەفۆنەکەی ئەویش ناچێت، یان یەکێک لە فرۆشگاکەوە هەواڵی پێ نادات. دڵنیام ئەو ئیمەیڵە لە هەموو فرۆشگاکاندا باسکراوە. لەوانەیە ئەمە یەکەم جاربێت لە ناکاو ئیمەیڵێکی لەو شێوەیە بۆ هەموو کەرتەکە بنێردرێت...

گوتی با ئێوارە یەک ببینین و بە ئارامی تەلەفۆنەکەی داخستەوە. واتە چاوەڕێم نەدەکرد سوپاسم بکات، بەڵام هیچ نەبێ دەبوو

کەمێک بە باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکردمایە، وانییە؟ ئەوبوو کە پێی دەگوتم: "بڕۆ بیفرۆشە و وەرەوە، هیچ نابێت"، دیارییەکانیش هەر هی ئەو بوون، وە لەبەر ئەوەی ئەو منداڵی هەیە من خۆمم خستە ئاگرەوە لە جێی ئەو. ئەمە چ دووڕیانێکە؟ وەک ئەوەی شەیتان لەبەردەممدا وەستابێت و فریشتەکانیش لە پشتمەوە بن و هەردووکیان بانگم بکەن، بەڵام نەمدەتوانی بڕۆم بۆلای هیچیان. هەڵبژاردەی سێیەمیش ئەوەبوو خۆم لە کەندەڵانەکەوە هەڵبدەمە خوارەوە. وابزانم من هەڵبژاردەی سێیەمم هەڵبژاردوو، جوان جوان خۆمم هەڵدابووە ناو ئاگرەوە، وە تەنها یەک پرسیار لە مێشکمدابوو: چی بە دایکم بڵێم؟ ئەگەر ئەمە ببیستێت زۆر خەمدەخوات. من کەسێکی ڕاستگۆبووم، چۆن شتێکی ئاوا بەسەر مندا دێت؟ بەڕاستی شایەنی ئەمە نەبووم. وشەیەک نادۆزمەوە بۆ باسکردنی باری دەروونیم لەو ساتەدا.

ئەها لە گۆرانییەکدا دەڵێت: "شتێکبوو وەک مردن، بەڵام کەسی نەکوشت". وەڵاهی ئەو ساتەش ئاوابوو. مردن هات و منی کوشت، بەڵام هێشتا دەژیام. هەناسەم دەدا، بەڵام دڵم وەستابوو. ڕێک پەلەقاژەی مەرگم دەکرد...

ئەگەر ئارامبگریت بەرامبەر سەختییەکان و
بزانیت کە هەموو دەردێک لەلایەن
خوداوە دەنێردرێت،
ئەوا سەختییەکانت بۆ ئاسان دەبێت
وە دەتوانیت بە ئاسانی
زاڵ ببیت بەسەریدا.



**ئەگەر کۆتایی دونیا بێت، تەمەن تەواو ببێت،**
**ئەگەر لە کۆتا وێستگەشدابیت،**
**بێ ئومێد مەبە لە خودا.**

بڕیارمدا هیچ بە دایکم نەڵێم. بەردەوام دەبووم لە پاس شتن و لەو ماوەیەدا خێرا کارێکم دەدۆزییەوە. دەبوو خێرا پلانەکانم دابنێم، چونکە پێویستمان بە پارەبوو و کاتێک ئەو پەڕاوی دەست لە کار کیشانەوەیەم واژۆ کرد مووچەم وەرنەگرتبوو و نەشمدەزانی کە وەری دەگرم یان نا، هێندە بە تووڕەییەوە واژۆم کردبوو هەر نەمخوێندەوە تا بزانم وەری دەگرم یان نا...

چاوەڕێبووم ببێت بە ئێوارە و پەیوەندیم پێوە بکەن. هەموو کەس کە هەواڵەکەیان دەبیست یەک یەک پەیوەندیان پێوە دەکرم، بەڵام لە ڕووم نەدەهات وەڵامی کەسیان بدەمەوە. هەر بەڕاستی چیتر هەموو کەس منی بە دز دەزانی؟ ئەم دۆخە زۆر سەخت بوو بۆم. بەڕای خۆم کارە ڕاستەکەم کردبوو. بەڵام خۆمم خستبووە ناو ئاگرەوە لەبەر ئەوەی ئەوان خێزاندارن و منداڵیان هەیە. ئەمە کارە ڕاستەکە بوو؟ ئێوە پێم بڵێن ئەمە کارە ڕاستەکە بوو؟

نازانم بەس بە ڕای من لە شتێکی خراپ دەچوو، بەڵام هەمیشە ئەم ڕستەیە لە مێشکمدابوو: "لە هەموو خێرێکدا شەڕێک هەیە، لە هەموو شەڕێکیشدا خێرێک هەیە، ئێمە نایزانین، بەڵام خودا

دەیزانێت". نەمدەتوانی بەم کاتە بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە، لە هەمووی باشتر ئەوەبوو بچم بۆ دوکانی هاوڕێکەم. هیچ کارێکم نەبوو، ئەگەر بڕۆیشتمایەتەوە بۆ ماڵەوە دایکم دەیگوت؛ "بۆ ئێستا هەتوویتەتەوە؟" منیش هیچ وەڵامێکم نەبوو بۆ ئەم پرسیارە. تەلەفۆنەکەم هەر بێدەنگ نەدەبوو، بەردەوام پەیوەندی و نامەم بۆ دەهات.

بۆ ساتێک بیرم لە مردن کردەوە... لە دڵی خۆمدا دەمگوت؛ "تەنها مردن دەتوانێت من لەم دۆخە ڕزگار بکات". هەتا دووکانەکە بیرم کردەوە سیناریۆم دەنووسی لە مێشکمدا. کە گەیشتمە دوکانەکە و هاوڕێکەم منی لەو دۆخەدا بینی ڕاستەوخۆ تێگەیشت کە شتێک بووە. بێ ئەوەی سڵاوم لێ بکات پرسی؛ "چی بووە؟" بەڵام من لە دۆخێکدابووم کە شەرمم لە باسکردنی دەکرد، بەڕاستی زۆر سەختبوو بۆم. نەمتوانی باسی هیچ بۆ هاوڕێ دوکاندارەکەم بکەم هەر گوتم؛ "هیچ نییە". بەڵام دیاربوو کە شتێک بووە. چاوەڕێبووم زەنگی تەلەفۆنەکەم لێبدات و بێن بەشوێنمدا و ڕزگارم ببێت لەم دۆخە.

لە کۆتاییدا زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا و دوو یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکە بەیەکەوە هاتن و منیان هەڵگرت. سەرم سوڕمابوو، دوو کەسی زۆر جیاواز بوون، ناکرێت بەیەکەوە کار بکەن. ڕاستە لەیەک نزیکبوون و یەکتریان دەناسیگ بەڵام کە بەیەکەوە هاتن بۆ لای من بۆ ساتێک کەوتمە گومانەوە. کە چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە یەکسەر پرسیم؛ "من ئێستا چی بکەم؟"

یاریدەدەری بەڕێوەبەرە باشەکە، فورکان گوتی؛ "ئارامبەرەوە، با بچین بۆ شوێنێک، دابنیشین و قسە بکەین".

یاریدەدەری بەڕێوەبەرە خراپەکە تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، سێرجان گوتی؛ "ئارامبەرەوە کوڕم، چارەسەری دەکەین، قابیلە ئیش نەبێت بۆ تۆ؟ تۆ کارە ڕاستەکەت کرد، ئارامبەرەوە".

زەردەخەنەیەک لەسەر ڕوخساری بوو، هەستم دەکرد دڵخۆشبووە بە خەمباری من، یانیش لەبەر ئەوەی ناوی ئەوم نەگوتووە ئاوا دڵخۆشبوو. دواتر لە سوچێکدا ئۆتۆمبێلەکەیان ڕاگرت، بەڵام من پەرێشانبووم. دەستم لە ناو قژمدابوو، بە بەردەوامی قاچم ڕادەوەشاند و دانە کیڕەم دەکرد. باری دەروونیم تەواو تێکچووبوو. دوکانێک هەبوو لەو شوێنەی لێی وەستابووین، کاکە فورکان گوتی؛ "با بچم شتێک بهێنم بیخۆینەوە، دەم و زمانمان وشکبوەوە. چی دەخۆنەوە؟" من لە بەیانییەوە نانیشم نەخواردبوو. نازانم شەکرەم دابەزیبوو یان چی، خەریکبوو دەبوورامەوە. کە کاکە فورکان پرسیاری خواردنەوەکەی کرد ئینجا هەستم بە برسێتی و بێ هێزی خۆم کرد...

گوتم؛ کاکە "کێکێک و ئاوێکم بۆ بهێنە". سێرجان-یش پێی گوت کە چی دەوێت و کاکە فورکان لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی. لەو کاتەدا سێرجان یەکسەر ڕووی تێکردم و چەند ڕستەیەکی وەک؛ "ئارامبەرەوە، بەپەلە کارت بۆ دەدۆزینەوە، ئاسوودەبە، براگەورەکانت لیرەن، مەترسە."ی گوت، بەڵام بەباشی لێی تێنەدەگەیشتم، هەستم دەکرد چاوەکانم دادەخرێت، بیرم لەوە

دەکـردەوە فورکان زوو بێتەوە و خێرا کێکەکە بخۆم. دیارە شەکرەم دابەزیبوو، زەختم یاری کردبوو، پزیشک نیم، بەڵام لەشی خۆمم دەناسی، هەستم بە باشی نەدەکرد. باش نەبووم، هیچ باش نەبووم...

هەتا فورکان هات لە هیچ قسەیەکی سێرجان تێنەگەیشتم بە باشی. فورکان هاتەوە، کێک و چوکولاتەی بۆ کڕیبووم. یەکسەر لێم وەرگرت و دەستم کرد بە خواردنی. فورکان تێگەیشت کە باش نیم و گوتی: "کوڕم، ئەری تۆ باشیت؟ هانێ ئاویش بخۆرەوە". دوای ئەوەی چوکولاتەکەم خوارد کەمێک هاتمەوە سەر خۆم و پاڵمدایەوە. ئاوەکەم خواردەوە و کێکەکەم خستەلاوە، لە کۆتاییدا ساتە چاوەڕوانکراوەکە هات: لە ناکاو دەستم کرد بە هاوارکردن، جنێوم پێ دەدان، ڕێک هاوارم کرد بەسەر هەردووکیاندا و گوتم: "من ئێستا چی بکەم ها؟"

فورکان هەوڵی دەدا ئارامم بکاتەوە، سێرجان-یش بە ترسەوە سەیری دەکردم، نەیدەتوانی هیچ بڵێت، چونکە ئەو تاوانباربوو، بۆ ئەوەی ئەو نەسووتێت خۆم هەڵدابووە ناو ئاگرەوە. مەڵێن: "ئەری مرۆڤ خۆی دەخاتە ئاگرەوە؟" ئەمە مەسەلەی ویژدانە و من خۆمم خستە ئەو ئاگرەوە. لەوانەشە بێ مێشکیبووبێت...

فـورکـان هـەر دەیـگـوت: "چـارەســەری دەکـەیـن" و منی ئارامکردەوە.

لەلای ئێمە تەنها گوتەی خودا دەخوات.

دەرد و خەم دەکێشین،

فرمێسک دەڕێژین بە لافاو،

دەڵێین مردین بەڵام نامرین.

دەبێت بزانین ئەگەر بێ نزابین

ئەوا بێچارەش دەبین.



لەو ماوەیەدا بێ وەستان پەیوەندیم پێوە دەکرا، خاوەنی دوکانی دیارییەکان پەیوەندی دەکرد. بە فورکان-م گوت؛ "ئەرێ ئەمە بۆ هێشتا پەیوەندیم پێوە دەکات؟" گوتی؛ "کێیە؟" گوتم؛ "خاوەنی دوکانی دیارییەکانە". گوتی؛ "وەڵامی بدەرەوە خێرا، لەوانەیە دووبارە کەسێک چووبێتەوە بۆلای". ڕاستی دەکرد، لەو کاتەدا هەر نەمدەتوانی بیر بکەمەوە. کە هەڵمگرت یەکسەر خاوەن دوکانی یارییەکان بە دەنگێکی ئارامەوە گوتی؛ "هەر کاتێک پێتکرا سەرێکم لێبدە، با کەمێک قسە بکەین، ئەو کاتە زۆر تورە بوویت". وەک هەرزەکارێک لوتم لێکرد و پێم گوت کە هەرگیز ناچمەوە بۆلای و هێشتا ئەو هەڵەیەم لەیاد نەکردووە کە کردی بەرامبەرم و تەلەفۆنەکەم داخستەوە. فورکان کە زانی شتێکی گرنگ نەبووە دەستی بە قسە کرد و گوتی؛ "با ئێستا بە ئارامی قسە بکەین. کورە تۆ گەمژەیت؟ بۆچی ناوی ئێمەت نەگوت؟"

گوتم؛ "کاکە چۆن بمگوتایە؟ کاکە سێرجان نەیگوت 'من منداڵم هەیە و خێزاندارم، تەمەنم تێپەڕیوە...' چیم بگوتایە دوای ئەوەی منتان خستە ئەو دۆخەوە؟ خۆی نەیگوت؛ "نەکەی ناوی من بڵێیت'؟ خۆت نەتگوت کاکە سێرجان؟"

سێرجان، ڕەنگ بە دەموچاوییەوە نەمابوو، گوتی؛ "بەڵێ وامگوت، بەڵام نەمزانی ئاوای لێ دێت. وەڵاهی زۆر سەرم سوڕما کە ئیمەیلەکەم بینی." هەرچەندە گوتیشی؛ "وەڵاهی" بەڵام هێشتا نەمتوانی باوەڕی پێ بکەم. ئەگەر ئێوەش ئەو ڕوخسارەیتان ببینیایە ئێوەش باوەڕتان پێنەدەکرد. فورکان ڕووی کردە سێرجان و دەستی کرد بە نەڕاندن بەسەریدا و گوتی؛ "کوڕە تۆ چۆن شتی وا دەڵێیت؟ بەڵام پێتخۆشبوو کە پارەکانت بە زیادەوە وەردەگرت، وانییە؟ ئێستا ئەم کوڕە چۆن ئیش بکات؟ دەزانی کێشەی هەیە، دەردی هەیە؟"

لە ڕاستیدا سێرجان دەیزانی کە پێویستمە، لە سەرەتادا باسی کێشەکانمم بۆ کردبوو. فورکان هەرچەندە نەشی دەزانی بەڵام زیاتر بیری لێدەکردمەوە و وەک برا گەورەیەکبوو لەگەڵمدا. سێرجان بەم ڕستەیە دەری خست کە کەسێکە شەرم لە هیچ ناکات: "لەکوێوە بمزانیایە ئاوای لێ دێت، ئەگەر بمزانیایە کاری وام دەکرد؟ چی بڵێم ئێستا، سوپاسی ئاسلان بکەم لەسەر ئەو کارە؟ ئەویش دەیزانی کە مەترسییەکی لەو شێوەیەی تێدایە. من چی بکەم ئیتر"؟

کە ئەم ڕستەیەم بیست هێندە دەستم و دانەکانم توند کرد خەریکبوو شەقم دەبر لە داخا. فورکان هاواری بەسەر سێرجان-دا کرد و کەمێک جنێوی پێدا. سێرجان لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و دەرگاکەی بە توندی داخستەوە و جگەرەیەکی داگیرساند. منیش تەنها سەیرم دەکرد. سەیری لەناوچوونمم دەکرد. ڕێک گیانم

دەسپارد. پەلەپیتکەیەکیان لێبدامایە دەتەقیمەوە و دەستم دەکرد بە گریان. لە ناخی خۆمدا هاوار و ناڵەم دەنگی دەدایەوە.

سێرجان بەدەم تەلەفۆن کردنەوە لە ئۆتۆمبێلەکە دوورکەوتەوە. فورکان یەکسەر گوتی؛ "سەیرکە کاکە گیان، ئەگەر پێویستت بە شتێکە بیڵێ. ئەگەر پارەت لێبڕا دەتوانی پێم بڵێیت، من براگەورەی تۆم." کە وای گوت حەزم دەکرد باوەشی پێدا بکەم، بەڵام نەمتوانی، تەنانەت هێزم نەبوو باوەشیشی پێدا بکەم. زەردەخەنەیەکم کرد و سوپاسم کرد و گوتم؛ "دەبێت بەپەلە کارێک بدۆزمەوە". گوتی؛ "سیڤییەکەت ئامادە بکە، بۆم بهێنە، بەیەکەوە دەچین بۆ چەند مۆڵێک و بڵاوی دەکەینەوە. لە ماوەیەکی کورتدا کارێکت بۆ دەدۆزینەوە. تۆ لە ئێستادا هیچ پێویستییەکی بەپەلەت هەیە؟" بێگومان زۆر پێویستی بەپەلەم هەبوو؛ کارەبا، گازی سرووشتی، کرێ، براکەم، دایکم... چەندین شت بە میشکمدا دەهات بەڵام گوتم؛ "نا کاکە سوپاس"...

دەبوو سێرجان لە جیاتی فورکان ئەم پرسیارانەم لێبکات. بەهۆی سێرجان-ەوە ئەمانەم بەسەردا هات، ئەو کە گوتی؛ "هیچ نابێت، برۆ بیفرۆشە و وەرەوە." منی خستە ئاگرەوە. ئەگەر لەو کاتەدا بیگوتایە "بگەڕێرەوە، مەترسیدارە" لەوانەبوو ئەمانە هیچی ڕوونەدات، بەڵام پارە شیرینە و ئەویش پارەی خۆشدەویست. دەبوو یەکسەر ئەو پارەیەی بەدەست بگات، تا یەکسەر بیخوات. من و ئیش و کاری من بێ بەها بوو بۆ ئەو. لەو کاتەدا سێرجان هاتەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە و بە پێکەنینەوە گوتی؛ "من کارێکم

بۆ ئاسلان دۆزییەوە". یەکسەر هەڵبەزیمەوە و گوتم: "لە کوێ، واتە چۆن؟" ناوی مارکەیەکی پێڵاوی گوت لە مۆڵێک و گوتی کە بەڕێوەبەرەکەی هاوڕێیەتی، پەیوەندی پێوە کردووە و هاوڕێکەشی گوتویەتی با بەیانی سیڤییەکەی بهێنێت. فورکان-یش گوتی: "سەیرکە، کارمان دۆزییەوە. لەمە بەدواشەوە کاتێک دیارییەکانمان فرۆشت سێ قاتی ئەو پارەیەت دەدەینێ کە پێشتر پێماندراویت، منیش و سێرجان-یش".

خۆزگە لەو ساتەدا ڕوخساری سێرجانتان دەبینی، ئەم ڕستەیە کاریگەری بومەلەرزەیەکی هەبوو لەسەری. نیگاکانی دەیانگوت: "من نایدەم". خۆی هەر پێویستیشم بەوە نەبوو، کەسێک کە هەقی خۆمم نەداتێ، ئێستا لە هەقی خۆم زیاترم دەداتێ؟ ئەگەر بشمداتێ وەک خێر پێم دەدات. سوپاسم کردن و گوتم: "هەقی خۆم چەندە ئەوەندەم پێ بدەن بەسە." و بابەتەکەم داخست. دەبوو ئامادەکاری بکەم بۆ ڕۆژی دواتر و سیڤی ئامادە بکەم. کارەبامان نەبوو، گازی سرووشتیمان نەبوو، کاتی کرێدان نزیک بووبووەوە. قیستی ئەو کەلوپەلانەی بۆ ئاهەنگی خوشکەکەم کڕدرابوون نزیک بووبووەوە و ئەو پارەیەی بۆ براکەشمم ناردبوو خەریکبوو تەواو دەبوو، پارەکەی ناوی گیرفانی منیش بەشی هیچیانی نەدەکرد. مرۆڤەکان ئاوا بێچارە دەبن... دارێکی تەمەن بیست و دوو ساڵبووم، هەموو گەڵاکانم هەڵوەریبوو، هەموو ڕەگەکانم وشک بووبوون لە بێبارانیدا.

منیان بردەوە بۆ ماڵەوە و کاتی چاوەڕوانیکردنی بەیانی هاتبوو، بەڵام دەبوو بچم بۆ دوکانی هاوڕێکەم و سیڤی ئامادە بکەم. ئەویشم کرد و چوومەوە ماڵەوە. شەو هات و خەوتین. ڕۆژ هەڵهات و هەستاین لە خەو.

کە هەستام بینیم فورکان نامەی ناردووە، نووسیبووی؛ "وێنەی زۆر لە سیڤییەکە بهێنە با لە هەموو شوێنێک دایبنێین". هەستام و خێرا خۆمگۆڕی و لە ماڵ چوومە دەر، دووبارە ڕێی دوکانی هاوڕێکەمم گرت. پانزە بیست وێنەی سیڤییەکەمم ڕاکێشا. پەیوەندیم بە سێرجان-ەوە کرد و ژمارەی تەلەفۆنی بەڕێوەبەرەکەی هاوڕێیم لێ وەرگرت و بەرەو مۆڵەکە کەوتمە ڕێ. سیڤییەکەمم لەوێ دانا و هاتمە دەرەوە، سیڤییەکەمم لە هەموو ئەو فرۆشگایانە دانا کە نووسراوی "پێویستمان بە کارمەندە"یان هەڵواسیبوو. دایکیشم وایدەزانی کە چووم بۆ سەر کار، شەو نەمتوانی هیچی پێ بڵێم. هێندە شەرمم کرد نەمتوانی دانیشم و گفتوگۆشی لەگەڵدا بکەم، نەمتوانی هەر حاڵ و ئەحواڵیشی بپرسم، یەکسەر چوومە ژوورەکەی خۆم و خەوتم. دوای ئەوەی سیڤییەکانم دابەشکرد، تەنها یەک دانەم پێمابوو، دەبوو بچم کۆپی بکەم و بیبەم لە مۆڵێکیتریش دابەشی بکەم. چووم بیست دانەی ترم کۆپی کرد و بەرەو مۆڵێکی دیکە بەڕێ کەوتم. نانی بەیانیشم نەخواردبوو، لەوانەیە دەمیشم بۆنی کردبێت، بەڵام من هەستم بە هیچ نەدەکرد. تەنانەت ئاویشم نەخواردبوەوە، دووبارە شەکرەم دادەبەزییەوە، بەڵام هەر بیریشم نەبوو...

چووم بۆ مۆڵەکەی تر و دەستم کرد بە دابەشکردنی سیڤییەکەم. لە ماوەی سێ چوار کاتژمێردا بە لایەنی کەمەوە سیڤیم بۆ چل پەنجا فرۆشگا بردبوو. دەمێکبوو بووبوو بە نیوەڕۆ و فورکان پەیوەندی پێوە کردم. گوتی؛ "چیتکرد کاکە گیان، باشیت؟ سیڤییەکانت دابەشکرد؟ بردت بۆ کوێ؟ نانت خواردووە؟ پارەت پێیە؟"

کاتێک فورکان ئەم پرسیارانەی دەکرد سێرجان چی دەکرد؟ هەر پەیوەندیشی پێوە نەکردم. براگەورەیی فورکان وای دەکرد هەست بە باشی بکەم. ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستم بە براگەورەیەک هەبوو، وە فورکان کە بێگانەیەکە زۆر لە خزمەکانم نزیکتربوو لێم. زۆر منی نەدەناسی بەڵام دەردی منی کردبوو بە دەردی خۆی. کەسێکی باشبوو، ئەم جارە هەڵە نەبووم. فورکان لە پەیوەندییەکەدا گوتی کە قسەی لەگەڵ سێرجان کردووە و گوتوێتی بە دڵنیاییەوە دوکانی پێڵاوەکە وەرمدەگرن. زۆر دڵخۆشبووم. پێمگوت کە پەیوەندی پێوە دەکەمەوە و تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

کات تێدەپەڕی و من هێشتا سیڤیم دابەشدەکرد. بۆ هەموو فرۆشگاکانی ناو مۆڵەکەم بردبوو. مۆڵەکە نزیکبوو لە وێستگەی میترۆوە، ویستم شتێکی وەک سمیت و چۆرەک بکڕم. لەبەر ئەوەی پارەم پێنەبوو بە پێ چووم بۆ میترۆکە. لە دوکانێک شەربەت و ناوساجیم کڕی و خۆم تێرکرد. کاتێک ئەوانەم دەخوارد بیرم کەوتەوە کە لە بەیانییەوە جگەرەشم نەکێشاوە،

چونکە جگەرەم پێ نەمابوو پارەشم پێنەبوو تا بیکڕم. دووبارە زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا، دووبارە کاکە فورکان پەیوەندی پێوە کردمەوە. پرسی؛ "بێم هەڵتبگرم؟" گوتم؛ "وەرە کاکە". نزیکەی سی خولەک لەسەر کورسییەک دانیشتم و چاوەڕێی فورکان-م کرد. هات و هەڵیگرتم، هەر کە چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە گوتم؛ "کاکە جگەرەیەکم بدەرێ". بە زەردەخەنەیەکەوە بۆی درێژکردم. پرسی؛ "کوڕە جگەرەشت پێ نییە؟" منیش پێمگوت کە تەواو بووە، بەڵام ئەو تێگەیشتبوو.

منی دەبردەوە بۆ ماڵەوە. لە ڕێگا کەمێک گفتوگۆمان کرد. لە بەنزینخانەیەک وەستاین بۆ بەنزین کڕین، گوتی؛ "دەچم بۆ دەستشۆر" و کە هاتەوە پێنج پاکەت جگەرەی پێبوو. مرۆڤ دەکرێت ئەو دۆخانەی پێناخۆشبێت، منیش پێم ناخۆشبوو. لەبەر ئەوە نەبوو بڵێم؛ "کەوتوومەتە چ دۆخێکەوە؟" بەڵکو ئەوەم پێناخۆشبوو کە ئەو کەسەی یارمەتیم دەدات بێگانەیەکە. گوتم؛ "کاکە بۆچی کڕیت پێویستی نەدەکرد"، بەڵام وەڵامێکی برا گەورانەی زیرەکانەی دامەوە و گوتی:

"ئاسلان، پێویستی نیشانەی لاوازی نییە، پێویستی تەنها پێویستییە." کە وای گوت هیچ وەڵامێکم پێنەبوو بۆی و بێدەنگبووم. پرسی کە سیڤیم بۆ کوێ بردووە و منیش یەک یەک بۆم باسکرد. گوتی؛ "بۆ یەک دنیا شوێنت بردووە، بە دڵنیاییەوە پەیوەندیت پێوە دەکەن، خەمت نەبێت". منی بردەوە بۆ ماڵەوە و ماڵئاواییمان کرد. بەهۆی کاکە فورکان-ەوە هێندە هەستم بە باشی دەکرد

حەزم نەدەکرد هەرگیز بڕوات و دووربکەوێتەوە لێم. دەمویست هەر وەک دوو برا بگەڕێین، بەڵام ژیان هێندە خۆش نییە.

که هاتمەوە دایکم بە مەراقەوە چاوەڕێی من بوو. لەبەر ئەوەی بەیانی زوو لە ماڵ چووبوومە دەر و شەویش هیچم پێ نەگوتبوو، کەمێک خەمی منی بوو. دانیشتم و گفتوگۆم لەگەڵدا کرد. پێمگوت کە کارەکانم باش دەڕوات، بەم نزیکانە هەموو شتێک باشدەبێتەوە و پێویست ناکات خەم بخوات، و دوای ماوەیەکی زۆر کەم کێشەی کارەبا و گازی سرووشتیش چارەسەر دەکەم. هێندە درۆی جوانم بۆ دایکە جوانەکەم دەکرد... بەڵام دەمزانی ئەمانە درۆی بێتاوانن. دەمێکبوو نەفسی خۆمم لەیادکردبوو، چیتر نەفسم نەیدەتوانی کارم تێبکات و تەنها بۆ دایکم و خێزانەکەم دەژیام. درۆی گەورە و خراپم نەدەکرد تەنها درۆی سپیم دەکرد تا دایکم خەم نەخوات...

دایکم بە چاوەکانی و قسەکردنیدا دیاربوو چەند ماندووە. لێم پرسی؛ "بۆچی هێندە ماندوویت؟" گوتی؛ "ماڵم پاککردەوە". من چووزانم هەموو ڕۆژێک دەچێت بۆ پاککردنەوەی ماڵی خەڵکیتر؟ هیچیشی نەدەگوت تا من تێنەگەم. شتی زۆر سەختم بەسەردا هاتبوو، بەڵام تا ئەو تەمەنە شتی وام بەسەردا نەهاتبوو. گەنجێکی بێباک بووم، بەڵام ئەم ماوەیە وەک دەستێکی شکاو بووم، بە بەردەوامی خوێنم لێ دەهات و چاوەکانم شەوان وەک تاڤگەیەک فرمێسکیان لێدەڕژا. شەوشادم لە دایکم کرد و چوومە ژوورەکەی خۆم.

ئێستا زووتر دەچوومە ژوورەکەی خۆم. لە ماڵەکەدا هیچ ڕووناکییەک نەبوو جگە لە ڕووناکی مۆم، تەنها ئاومان هەبوو و ئەویش خەریکبوو دەبڕدرا. بە ئەگەرێکی زۆرەوە بەیانی هەواڵ لە دوکانی پێڵاوەکەوە دەهات، بۆیە دڵم بەپەلە لێیدەدا. بەیانیش هەر وەک ئەوەی بڕۆم بۆ سەر کار لە ماڵ دەردەچووم و تەنها پارەی ڕۆیشتن و هاتنی پاسم پێبوو. تەنها دەمتوانی بڕۆم بۆ شوێنێک و بگەڕێمەوە، بەڵام نە دەمتوانی نان بخۆم نە ئاو بخۆمەوە، نەمدەتوانی هیچ بکەم. نزام کرد و خەوتم؛ وەک مردوو خەتبووم. بەیانیش وەک ئەوەی بڕۆم بۆ سەر کار لە ماڵ چوومە دەرەوە و مەودایەکی زۆر بەپێ ڕۆیشتم و لەسەر کورسییەکی ناو پارکێک دانیشتم، دەستم کرد بە چاوەڕوانیکردن. دەبوو کەسێک پەیوەندیم پێوە بکات. ئایا دەبوو تەنها ئۆتۆمبێل و پاس بشۆم و بەردەوام بڕۆم بۆ ئەوێ؟ بەڵێ دەبوو تا هەواڵ لە شوێنێکی دیکەوە دێت بڕۆم بۆ ئەوێ.

جارێ زووبوو، بەڵام بڕیارمدا دوایی بڕۆم بۆ ئەوێ. پەیوەندیم بە هاوڕێیەکمەوە لە فرۆشگا کۆنەکەم کرد و پرسیاری ئەو پەڕاوەم لێکرد کە واژۆم کردبوو. بۆ پرسیاری مووچەکەم پەیوەندیم پێوە کردبوو، بەڵام دووبارە هەموو ئومێدەکانی ناخم ڕووخان. لە پەڕاوەکەدا نووسراوە؛ "هەموو پارەکانی وەرگرتووە". وە لەبەر ئەوەی بێ خوێندنەوەی ئەمە واژۆم کردبوو ڕێک گەمژەیەکبووم بۆخۆم.

کۆمپانیایەکی گەورە و گران چاوی بڕیبووە مووچەیەکی من. هیچم لەدەست نەدەهات. تا تا دواتر هەرگیز ناڵێم؛ "تۆ بڵێی هیچم لەدەست بهاتایە؟ یان "ئایا هەموو ئەوانەم کرد کە لە دەستم دەهات"؟ بەڵی هەموویم کردبوو، تەنها ئەوەندەم لەدەست دەهات، تەواوبووم پێم نەما. ئایا لە تاقیکردنەوەی ئارامگریدابووم، یان تاقیکردنەوەکەشم لەگەڵ خۆمدا تەواوبوو؟

مرۆڤ کە سوتا دەگۆڕێت،
منداڵەکەی ناخی گەورە دەکات و
فێری دەکات بە ڕێکی بوەستێت.



مرۆڤ لە کاتە سەختەکانیدا بیر لە زۆر شت دەکاتەوە، گۆشەگیر دەبێت، یەک یەک فرمێسکەکانی لە ناخیدا دەنێژێت، ڕێک لە ناو قەفەزەی سنگیدا دەیانێژێت، کەس نییە فرمێسکەکانت بسڕێت، بۆیە هیچ چارەیەکی ترت نییە جگە لەوەی خۆت چارەسەری خۆت بکەیت. بەکورتی تۆ هەم دەبیتە پزیشک و هەم دەبیتە نەخۆش... سەختییەکان تەنگت پێ هەڵدەچنن و بێ وەستان لێت دەدەن، هیچ شوێنێکیشت نییە بۆی ڕابکەیت. ئەگەر بکەویت دەدۆڕێیت، دەتوانیت وازبهێنیت و بڕۆیت، بەڵام من خێزانێکم هەبوو و ناچاربووم بە ڕێکی بوەستم، ئەگەر نا چی بەسەر دایکم، براکەم و خوشەکەمدا دەهات؟ بەهۆی ئەم بیرۆکانەوە هەمیشە بە سەلامەتی و بە ڕێکی وەستام لەبەردەم ئەو لێدانانەدا...

پێویستم بە ڕووناکییەک، بە ڕێگایەک بوو...

وەک قوتابییەک ڕێک لە ناوەڕاستی ئەو وتەیەدابووم کە دەڵێت: "ژیان مامۆستایەکی دەست بە دارە"...

خولەکەکان وەک کاتژمێر تێدەپەڕین و کاتژمێرەکان وەک ڕۆژێک... هەموو شتێک قورسبوو. ئەری مرۆڤ حەز دەکات خۆر هەڵنەیەت؟ حەز دەکات دونیا بوەستێت؟ ئای حەزم لە چەند شت بوو... بەڕاستی دڵنیابە کە هەندێک هەستم هەیە ناتوانم بە وشە دەری ببڕم...

خۆتان بخەنە جێی من، بیرێک بکەنەوە بزانن هەستتان

بە چی دەکرد... ژیان منی خستبووە سەر زەوی و دەست و قاچمی شکاندبوو، گوێکانمی کەڕ کردبوو، زمانمی لاڵ کردبوو. وە لە کۆتاییدا بەڕێوەبەری دوکانی پێڵاوەکە کە هاوڕێی نزیکی سێرجان بوو پەیوەندی پێوەکردم، بە دەنگێکی لاوازەوە گوتی؛ "چۆنیت براکەم؟" و دەستی بە قسە کرد. لە کاتی قسەکردندا پێیگوتم کە سەیری سیڤییەکەمیان کردووە و پەیوەندییان بە شوێنە پێویستەکانەوە کردووە، بەڵام کاتێک پەیوەندیان بە فرۆشگا کۆنەکەمەوە -واتە ئەو فرۆشگایەی دەرکرابووم لێی و بوختانم بۆ کرابوو- کردبوو لەوێ یەکەسەر بە منیان گوتووە "دز"، بۆیە ناکرێت وەرم بگرن. دواتر گوتی؛ "ببورە" بەڵام ئەو وشەی "دز"ەی ناو قسەکانی فەرمانی مەرگی منی واژۆ کردبوو. ئیتر سێرجان-م بە تاوانباری هەموو شتێک دەزانی.

لە ڕاستیدا ئەو ساتانەم زۆر بیر نایەت؛ وشەکان و ڕستەکانم بیرە، بەڵام ئەو کاتە سەختانە هێندە ماندوویان کردووم کە کاتێک بۆت باس دەکەم ئازارم دەدەن، کە ئازارم دەدەن هەوڵ دەدەم بێنەوە یادم، کە هەوڵیش دەدەم بێنەوە یادم دەمخنکێنن... مەلە دەکەم و مەلەدەکەم، بەڵام هەر دەخنکێم. دۆخەکە ئاوابوو وە لە هەموو سیڤییەکانمدا ناوی ئەو فرۆشگایە نووسرابوو، چونکە تەنها لەوێ کارم کردبوو. کاتێک بیرم لەوە کردەوە کە هەموو کەسێک پەیوەندی بە ئەوێوە دەکات بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەرم و ئەوانیش یەکسەر دەڵێن "ئەو دزە"، دنیا بەسەرمدا ڕوخا. لە ڕاستیدا دونیا بەسەرمدا نەڕوخا، خۆ دونیا بۆ من هەر

نەبوو.

مرۆڤ نایەوێت ساتە ناخۆشەکانی بێتەوە یاد، لەوانەیە هەندێک کەس بەمانە هەر نەڵێن ئازار، بەڵام هەر کەسە ئازاری خۆی هەیە و مرۆڤ هەتا بەسەریدا نەیەت لە ئازاری کەسێکی دیکە تێناگات. بێگومان شتێکی تریش هەیە؛ مرۆڤ هەرچەند کاتی خۆش لەگەڵ کەسێکدا بەسەر بەرێت هێشتا هەر ساتە ناخۆشەکانی ئاسانتر دێتەوە یاد، ناخۆشییەکان خۆشییەکان دەسڕنەوە. لەوانەیە هەندێک کەسیش بەم شێوەیە بیر بکەنەوە، بەڵام ئەمە یەکێک نەبوو لەو ساتە ناخۆشانە، ئەمە ئازارێک بوو کە فێری ئەزموونی ژیانی دەکردم، ئازارێک بوو کە گەورەی دەکردم، یەکێک بوو لەو برینانەی هەرگیز سارێژ نابێت... یەکێک بوو لەو ئازارانەی هەمیشە بیرت دەهێنێتەوە کە لە کوێوە هاتوویت...

ئیتر ئاوابوو دۆستم. کارم دەست نەکەوت، کاریان پێ نەدام. لەکەیەکیان خستبووە سەر ناوم بە هیچ لێنەدەبوەوە. ئەمە لەکەیەکی پیس و نەفرەتی بوو. دەمگوت لەم دۆخە سەختەدا ئەم دەردە هەر بە خەیاڵمدا نایەت، بەڵام وانەبوو، پێم ناخۆشبوو، وشەکانم یەک یەک لە قورگ دەگیرا، بە کورتی شەرمم لەم لەکەیە دەکرد...

خەیاڵی کار لە مێشکم دەرچووبوو، نەمدەزانی چی بکەم. کاتێک لە پارکێک دانیشتبووم فورکان پەیوەندی پێوە کردم. پرسی "ئیشەکە بوو بە چی ئاسلان؟" خۆزگە هەر نەیپرسیایە، دەمم کردەوە دەستم کرد بە جنێودان بە سێرجان، قسە نەما پێی

نەڵێم لە تووڕەیدا. فورکان گوتی؛ "ئارامبەرەوە. لە کوێیت؟ کار هەیە، با بێم بەشوێنتدا، بڕۆین پارە پەیدا بکەین، بۆ شتی باش پەیوەندیم کردووە تورە مەبە." کە وای گوت هیچ تورەییم نەما و شوێنەکەمم بە فورکان گوت. دەستم کرد بە چاوەڕوانیکردن و با باسی بیرۆکەکانمتان بۆ بکەم کە لە کاتی چاوەڕوانییەکەدا دەهات بە مێشکمدا... هەرچییەک ببێت ئومێد بەشێکە لە ژیان. لە تاریکترین ڕۆژەکانیشدا ئەگەر بێ ئومێد بیت ئەوا هەرگیز خۆر هەڵنایەت، بەڵام دەبێت ئومێدی شتێکی درووست بکەیت. هەموو کاتێک ئومێدی من تەنها خودا بوو. لە دڵی خۆمدا نزام دەکرد و هەمیشە دەنگێک لە مێشکمدا دەیگوت؛ "خودا لەگەڵتە".

هەوڵمدا کارە ڕاستەکە بکەم، بەڵام بە هەڵە لێم تێگەیشتن و بە هەڵە باسیان کردبووم، بەڵام دەمزانی کە خودا هەموو شتێک دەزانێت بۆیە نەدەترسام. پێیان دەگوتم "دز"، شەرمم دەکرد و پێم ناخۆشبوو، بەڵام من کارێکی هەڵەم نەکردبوو و خودا ئەمەی دەزانی و لەگەڵ من بوو، هەستم پێدەکرد. ژیانمان هەرچەندە سەخت بێت دەبێت بڵێین؛ "خێرێکی هەر تێدایە" لە جیاتی ئەوەی بڵێین "بۆچی؟"

نەمدەزانی ڕۆژە خۆشەکان دێن یان نا، بەڵام دەمزانی ڕۆژی لەمە خراپتر نابێت. بۆیە هەرگیز ناڕەزاییم دەرنەدەبڕی لە تاقیکردنەوەکەم. دەکرا ڕۆژی خۆش ببینم، دەکرا ئامادەبم بۆ ئەمە یان خۆمی بۆ ئامادە بکەم، بەڵام دەمزانی کە نەدەبوو خراپ و خراپتر لەمە ڕوووبدات، بەرگەم نەدەگرت، هێزی

بەرەنگاربوونەوەم نەدەبوو. نزام بۆ خودا دەکرد و دەمگوت؛ "لە هەموو خێرێکدا شەڕێک هەیە و لە هەموو شەڕێکیشدا خێرێک هەیە"، چاوەڕوانبووم و هەمیشە ئەم کۆپلەیەی مەولانا بە مێشکمدا دەهات:

گوتی "لە عەزابدام"

نەخێر، لە تاقیکردنەوەدابوو.

وە ئەگەر پێی بزانیایە ڕزگاری دەبوو.

من پێم زانیبوو، بۆیە لەوانەبوو ڕزگارم ببوایە. خودا دەزانێت؛ هەرگیز ئەم ڕستانەم لە مێشکم دەرنەهێنا، هەرگیز...

وە دەست و قاچم هەبوو کاریان دەکرد. خراپتر لە خراپتریش هەیە؛ دەکرا نەخۆشبم، بەڵام هیچ کێشەیەکی تەندرووستیم نەبوو. دایکم دەگریا، هەرچەندە باری دەروونی کەمێک تێکچووبوو، بەڵام زۆر سوپاس بۆ خودا ئەویش باشبوو.

سوپاس بۆ خودا، باشبووین...

فورکان هات، چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەیەوە. یەک دنیا دیاری لەسەر کورسییەکەی دواوەبوو. دوای ئەوەی باوەشمان بەیەکدا کرد، فورکان گوتی؛ "ئەمانە هەمووی دەفرۆشین بە دوکانی دیارییەکان، خێرا پەیوەندی پێوە بکە"، منیش خێرا پەیوەندیم پێوە کرد. یەک دنیا دیاری لێبوو، بەڕێکەوتین و فورکان دەستی کرد بە قسەکردن. گوتی؛ "هەموو شتێک باش دەبێت، مەترسە، من هەم براکەم. زۆر بیر لە مەسەلەی سێرجان-یش مەکەرەوە، ئەو کەمێک بێباکە بەڵام تۆی خۆشدەوێت".

بابەتی کار کرایەوە و پێی گوتم کە زۆر خەمبار بووە و دەبێت ڕێگایەکی دیکە بگرینە بەر، بەڵام پێمگوت کە هەرگیز لە ڕووم نایەت جارێکی ترلە مۆڵ و فرۆشگادا کار بکەم، ئەگەر کاریش بکەم کەسێک دێت و شتێکی ناخۆشم پێ دەڵێت و ئەوکاتە شتی خراپتر ڕوودەدات. هاوڕابوو لەگەڵم. لەو ساتەدا بە زۆر خۆمم گرتبوو تا ڕێگری لە فرمێسکەکانم بکەم. بە دۆخەکەی زانی و یەکسەر بابەتەکەی گۆڕی. گوتی؛ "با دیارییەکان بفرۆشین و پارەیەکی باش پەیدا بکەین ئاسڵان!" و پێکەنی.

چووین بۆ دوکانی دیارییەکان، دیارییەکانم فرۆشت و گەڕامەوە بۆلای فورکان، چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، بە خۆشییەوە پارەکەم پێدا، بەڵام کاکە فورکان گوتی؛ "برایانە بەشی بکە و بمدەرێ". دیسان بەشکردنەکەی بۆ من جێهێشتبوو، بەڵام من نەمدەتوانی بیکەم، خۆ ئەوانە هی من نەبوون، من تەنها ئامرازێکبووم لە نێوانیاندا و بەهۆی ئەم ئامرازییەوە لە کارەکەم و سومعەشم بووم. ئەمجارە فورکان نیوە بە نیوە بەشی کرد، تێنەگەیشتم بۆ، نزیکەی مووچەی مانگێکم پارەی پێدام. گوتی؛ "ئەمە هەقی تۆیە براکەم." منیش یەکسەر گوتم؛ "کەکە ئەمە زۆر نییە؟" لێم توڕەبوو، گوتی؛ "تۆ بەهۆی ئێمەوە لە کارەکەت دەرکرایت، ئیتر زۆری چی، شێتم مەکە! بیگرە و بیخەرە گیرفانتەوە، پێویستییەکانتی پێ پڕ بکەرەوە. ئەگەر سێرجان-یش هات بۆلات پێی بڵێ چەنێکت دەوێت، ئەگەر نەتداتێ ئەوا تۆش دیارییەکان نافرۆشیت. ئەمە وەک ئامۆژگارییەکی برا گەورەکەت وەربگرە".

سەرەتا تێنەگەیشتم بۆچی ئەمانەی گوت، بەڵام دواتر کە بیرم لێ کردەوە تێگەیشتم. ئەگەر من ئەوانەم نەبردایە و نەمفرۆشتایە سێرجان هەرگیز نەیدەتوانی بیانفرۆشێت، ئەو خۆی ناخاتە ئاگرەوە. نەشیدەتوانی ئەم کارە بکات هەتا کەسێک نەخاتە ئاگرەوە. بەو پارەیەی لە فورکان-م وەرگرت پارەی گازی سروشتی و ئاو و کرێی مانگێکم دەدا و پارەم بۆ براکەشم دەنارد. بەڵام دەبوو بە زووترین کات کارێک بدۆزمەوە چونکە هێشتا کێشەی کارەبام چارەسەر نەکردوو؛ دەبوو پارەی چوار پسوڵە بدەم. بێجگە لەمانە قەرزی دیکەشمان لەلا بوو کە بەدەستی وەرمان گرتبوو. دەبوو بەپەلە یەک دنیا پارەم دەست بکەوێت، بەڵام لە ئێستادا هیچ کارێکم نەبوو. فورکان منی لە بازاڕەکە دابەزاند و منیش پارەی پسوڵەکانمدا. پارەی گازی سرووشتیم دا و کەمێک پارەشم کردە کارتی ئاوەکەوە. پەیوەندیم بە خاوەن ماڵەکەمانەوە کرد تا کرێکەی بۆ بنێرم، سوپاسم کرد و کرێی مانگێکی ترم بۆ نارد. پەیوەندیم بە براکەمەوە کرد و پارەم بۆ ئەویش نارد، دیسان هیچ پارەم پێ نەما.

دەمەو ئێوارەبوو کە خاڵم هاتەوە یادم. باری دارایی زۆر باش نەبوو، بەڵام بەدوای کارمەندێکدا دەگەڕا. مووچەیەکی زۆریان نەدەدا، بەڵام هەر بڕیارم دا وەک شاگرد کاری لەگەڵدا بکەم. کاری چاککردنەوەی قازانی بۆیلەری دەکرد. قسەم لەگەڵ خاڵم کرد، ڕازی بوو، لە ماوەی یەک دوو ڕۆژدا دەستم بە کار دەکرد لەلای، بەڵام ئەو پارەیەی لەوێوە دەستم دەکەوت تەنها

بەشی کرێکەی دەکرد. بەڵام هیچیترم لەدەست نەدەهات، دەبوو لە شوێنێکەوە دەست پێبکەم، دەستم بەو کارە کرد هەرچەندە کارێکی سەختبوو و مووچەکەشی کەم بوو، چونکە لە شوێنەکانی تر داوای سیڤی و ئەزموونیان لێدەکردم...

کە بەڕێوەبووم بۆ ماڵەوە بیرم لەوە دەکردەوە توند توند دایکم لە باوەش بگرم، بە پێکەنینەوە گەیشتمەوە ماڵەوە و بە توندی باوەشم بە دایکمدا کرد. کە گوتم؛ "گازی سروشتی و ئاوم چارەسەر کرد، کرێکەم دا و پارەم بۆ براکەم نارد." دایکم نەیتوانی فرمێسکەکانی بشارێتەوە. گوتی؛ "کوڕم دیسان هەموو مووچەکەتت تەواو کرد؟" بەڵی هەمووی تەواو بووبوو. لە ڕاستیدا مووچەم هەر نەبوو، ژنە داماوە هەر ئاگاشی لەمە نەبوو. قسەم لەگەڵ خاڵم کردبوو و باسی هەموو ڕووداوەکانم بۆ کردبوو و پێشم گوتبوو کە بۆ دایکمی باس نەکات و ڕازی بوو. خاڵم کەسێکی متمانە پێکراو بوو، گوتی؛ "باشە خوشکەزام بێخەمبە." بۆیە دایکم بەوەشی نەدەزانی. لە ڕاستیدا ئەگەر بیشیزانیایە هیچ نەدەبوو، بەڵام لەو کاتەدا لە بارێکی دەروونی وەهادابووم کە لە هەموو شتێک دەترسام و بە حسابی خۆم بەو شێوەیە ڕێگریم لێ دەکردن. تاکە ئامانجم خەم نەخواردنی دایکم بوو.

کە چوومە ژوورەوە بینیم تەلەفیزیۆن و هیتەرەکە کار دەکات. بۆ ساتێک سەرم سوڕما، وامزانی دایکم چارەسەری کارەبای کردووە. بە خۆشییەوە لێم پرسی؛ بەڵێ، دایکم چارەسەری کردبوو، تەقسیمی بەیەکەوە نووساندبوو و لە باڵکۆنی دراوسێکەمانەوە

شۆڕی کردبووەوە و بەو شێوەیە چارەسەری کردبوو. کە هاتمەوە لە دەرەوەی بیناکەوە دیاربوو، بەڵام من نەمبینیبوو، دایکە جوانەکەم کارەبای لە دراوسێکەمانەوە ڕاکێشابوو بۆ گەرمکردنی ماڵەکەمان. خودا دراوسێی ئاوا باش بکات بە نسیبی هەموو کەسێک، هەوڵیاندەدا بەپێی توانا یارمەتیمان بدەن.

پارەی گازی سرووشتیم دابوو، بەڵام نەماندەتوانی بەکاری بهێنین، هیتەری کارەبایی مەنتقیتربوو، چونکە نەماندەتوانی هێندە پارەی گازی سرووشتی بدەین. چیتر ئاویشمان هەبوو، دەمانتوانی ئاویش گەرم بکەین. دوو هەفتەبوو خۆم نەشتبوو، دوای ئەوەی قسەم لەگەڵ دایکم کرد مۆمەکەم هەڵگرت و ڕامکرد بەرەو گەرماوەکە و ئەو کاتە تێگەیشتم کە ئاوی گەرم نیعمەتێکی چەند گەورەیە. سوپاسی خودام کرد و دەستم کرد بە خۆشتن. دوای سی خولەکێک دایکم لە دەرگای گەرماوەکەی دا و گوتی؛ "کوڕم باشیت؟" و منی هێنایە دەرەوە. هێندە ئاسوودەبووم و هیلاکیم دەرچوو بەو گەرماوە نەبێتەوە، دەست و قاچم چرچ بووبوون هێندە خۆم شتبوو...

مرۆڤ دوای لەدەستدان و دووبارە بەدەستهێنانەوەی ئەو شتانەی هەیەتی ئینجا لە بەهایان تێدەگات. کە لەدەستیشتدان هەر تێدەگەیت، بەڵام بەڕای من کە لە دەستتدان و دووبارە بەدەستت هێنانەوە بە بەهاتر دەبن لەلات. بەتایبەتی ئەگەر ئەمە پێویستییەکی مرۆڤ بێت، ئەوا ئارەزوو دەکەیت هەموو چرکەیەک سوپاسی خودا بکەیت. پێشتر هەرگیز سوپاسی خودام نەدەکرد

بۆ گەرماوێکی گەرم یان ئاو، ماڵێکی گەرم، ڕووناکی، گڵۆپ، ئاوی گەرم، ئاگری تەباخ و چای گەرم، بەڵام دوای ئەم ڕووداوانە دەستم کرد بە سوپاسکردنی خودا بۆ هەموو نیعمەتەکانی. چونکە هەمووی دیاری ئەو بوو. ماڵەکەمان گەرم بووبوو. لە بەیانییەوە دایکم هیتەرە کارەباییەکەی لە هەموو ژوورەکاندا داگیرساندبوو و هەموو ماڵەکەی گەرم کردبوو. خۆم شتبوو، دەمویست بۆخۆم بخەوم. دوای ئەوەی کەمێک قسەم لەگەڵ دایکم کرد چوومە سەر جێگاکەم. دەبوو بەیانی زوو هەستم لە خەو. تراکسودەکانیشمم ئامادە کرد و بە دایکمم گوت کە بەیانی فرۆشگاکە پاک دەکەینەوە، بەڵام لە ڕاستیدا دەچووم بۆ چاککردنەوەی بۆیلەر. دووبارە پەنام بردبووەوە بەر درۆی سپی بەرامبەر دایکم. هەستم کرد دایکم ماندووە. خەریکبوو درکم بە هەندێک شت دەکرد، بەڵام نەمدەتوانی قبوڵی بکەم، دەمگوت نا نا ناڕوات، بەڵام ئەو دەچوو بۆ پاککردنەوەی ماڵان.

بەیانی خۆر هەڵدەهاتەوە و ڕۆژێکی نوێ و کارێکی نوێ و ژیانێکی نوێ دەستی پێدەکرد، یەک دنیا شت هەبوون کە دەبوون بیانخەمەوە سەر سکە. هەندێک کات ژیان تۆ هەڵدەگرێت و دەتخاتە شوێنێکی دیکەوەوە و پێت دەڵێت "لێرەوە بەردەوامبە". ناتوانی یەک وشەش بڵێت و بۆخۆت لەوێوە بەردەوام دەبیت. منیش ئیتر لە شوێنێکی ئاوادابووم، لە کۆتایی ڕێگەیەکدابووم، لەو شوێنەدابووم کە هەمووشتێک کۆتایی پێدەهات و دووبارە دەستی پێ دەکردەوە...

شەوەکان بە سەختی تێدەپەڕین. مرۆڤ شەوان دادەنیشێت و قسە لەگەڵ خۆی دەکات، دیارە لەبەرئەوەیە شەوەکان هێندە درێژترن بەلامانەوە لە چاو ڕۆژەکاندا. گەورەترین هەڵەی مرۆڤ کاتێک قسە لەگەڵ خۆی دەکات ئەوەیە کە تەنها ساتە ناخۆش، سەخت و دەردەکان دەهێنێتەوە یادی خۆی، هەرگیز بیر لە ساتە خۆش و باشەکان ناکەینەوە. بە بیرکردنەوە لە ناخۆشی کات تێدەپەڕێت؟ بۆ من تێنەدەپەڕی، بۆیە شەوەکانم خۆشنەدەویست و زۆر درێژبوون بەلامەوە. هێندە قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد، هێندە دەمهێنا و دەمبرد وام لە خۆم دەکرد کە نەتوانم تەنانەت خەیاڵیش بکەمەوە. هاوڕێ ئێمە مرۆڤی باشین، بەڵام بە قورسی ساتە باش و خۆشەکان دێتەوە یادمان.

**کەمێک قەرزاری ئازاربووین،**
**بۆیە هەموو دڵخۆشییەکانمانی برد...**
**هەموو شتێکی کرد تا بگاتە ئامانجەکەی.**



**دۆستم، هەرگیز ناتوانیت لە ئازار ڕابکەیت.**
**ئەوە بزانە کە ژیان قەرزاری ئازارە.**
**دەکرێت ئەو قەرزەش لە تۆ وەربگرێتەوە،**
**لە منی وەرگرتۆتەوە بۆیە دەزانم...**

بەیانی بیجامەکانیشمم هەڵگرت و وەک ئەوەی بچم بۆ سەر کار لە ماڵ چوومە دەرەوە. بەرەو لای خاڵم دەڕۆیشتم. سەرێکم لە دوکانی هاوڕێکەمدا و سمیتێک و ماستاوێکم کڕی. هاوڕێکەم پرسی کە کەی تەلەفۆنەکەی پی دەدەمەوە؛ تەلەفۆنەکەی ئەوم بەکاردەهێنا و دەبوو بیدەمەوە، ئیتر دەبوو تەلەفۆنێک بۆ خۆم بکڕم. گوتم؛ "لەم یەک دوو ڕۆژەدا دەتدەمەوە" و سمیت و ماستاوەکەم کڕی و هاتمە دەرەوە، تا لای پاسەکان بەپێ ڕۆیشتم. لەو ماوەیەدا پەیوەندیم بە فورکان-ەوە کرد، پێمگوت؛ "کاکە پێویستم بە تەلەفۆنێکە". ئەو تازە تەلەفۆنێکی نوێی کڕیبوو، لێم پرسی؛ "دەتوانم تەلەفۆنە کۆنەکەت بەکاربهێنم؟" هەرچەندە پێمگوت کە دواتر دەیدەمەوە، بەڵام پێی گوتم بە دیاری پێشکەشم دەکات. تەلەفۆنێکی جوانبوو، ڕاستە کۆنەی ئەو بوو، بەڵام لەو تەلەفۆنەی خۆمبوو کە فرۆشتم، بە کورتییەکەی زۆر دڵم پێی خۆشبوو. ئێوارە سەری لێ دەدام و تەلەفۆنەکەی بۆ دەهێنام.

لە پاسەکەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە هیچ کات بۆ خۆم تەرخان

ناکەم، تەنانەت خۆشەویستیکیشم نەبوو. لە ڕاستیدا کەسێکی خێرابووم و کەمێکیش قۆزبووم، بەڵام ئەم ماوەیە نەمدەتوانی گرنگی بە هیچ بدەم. نە هێزم هەبوو نە توانای ماددی، کاتیشم نەبوو بۆ گەڕان لەگەڵ کەسدا. گەیشتمە لای خاڵم و چووین بۆ ئەو ماڵەی قازانەکەیانمان چاکدەکردەوە. یەکەم جارمبوو قازان چاکبکەمەوە، هەر نەمدەزانی کە قازان چییە. بە پێکەنینەوە ڕۆیشتین و چووینە دوو نهۆم ژێر زەوییەوە. تۆپەڵە ئاسنێکی گەورەی لێبوو... خاڵم گوتی؛ "ئەمە قازانە خوشکەزا." جلەکانی گۆڕی؛ کە جلەکانیم بینی زانیم ئیشەکە ئیشێکی چۆنە. جلەکانی کۆنبووبوون، ڕەش و پیسبووبوون و دڕابـوون. دیاربوو کە کارێکی چەند قورسە. منیش جلەکانم گۆڕی.

زۆر کەس دەزانێت کە قازان تۆپەڵە ئاسنێکی قورسی پارچە پارچەیە. ئەو وێنانەی ئێستا لە ئینتەرنێتدا هەیە هەمووی قازانی زۆر گرانبەها و نوێن، ئەوانەی ئێمە دەڕۆشتین بۆ چاککردنەوەیان هەموویان زۆر کۆنبوون. کە گەیشتینە ئەوێ خاڵم گوتی کە خۆی قازانەکە چاک دەکاتەوە و منیش دەبێت بچمە ناوی و دیوارێک هەڵبچنم. تەنها جێی یەک کەس دەبـووەوە لە ناویدا و منیشم دەچووم دیوارم هەڵدەچنی. خاڵم خشتەکانی پێدام و چیمەنتۆکەی ئامادە کرد. لێم وەرگرت و چوومە ناوییەوە و یەک یەک هەڵمچنی. ڕەش ڕەش بووبووم، بەڕاستی کارێکی قورسبوو و منیش هیچ بەهرەیەکم نەبوو بۆی، دەستم پێی ڕانەهاتبوو و هیچ دەست ڕەنگین نەبووم. خاڵم توڕە نەدەبوو، بەڵام هێندە پێم پێکەنی ژانی

کرد و منیش تورە بووبووم لەبەر ئەوەی پێم پێ دەکەنن. ئەم تورەییەم هی گەنجیمبوو. بەو تورەییەشەوە نەمدەتوانی هیچ کارێک بە باشی بکەم، هەموویم تێکدەدا. بەڕاستی ئەم کارە هیچ گونجاو نەبوو بۆ من و پێم نەدەکرا. لەبەر ئەوە نییە کە بە کەمی بزانم، بەڵام بە ڕاستی هیچم لە دەست نەدەهات. کارێکی قورس بوو؟ بەڵێ، کارێکی زۆر قورسبوو. جگە لەوەی زۆر قورسبوو من هیچ بەهرەیەکم نەبوو تێیدا.

تا ئێوارە خەریکی چاککردنەوەی یەک قازان بووین. دەبێت پارچەکانی لێ بکەیتەوە و دواتر یەک یەک پێوەی بکەیتەوە. لەبەر ئەوەی زۆر خراپبووم لە لێکردنەوە و پێوەکردنەوەیدا تەنها ئەو کەرەستانەم دەدا بە خالّم کە داوای دەکرد و بەو شێوەیە یارمەتیم دەدا، بەڵام لە کۆتا پارچەی قازانەکەدا گیرمانخواردبوو، بە هیچ نەدەچووەوە جێگەی خۆی و نەماندەتوانی پێوی بکەینەوە. خالّم بیری لێ دەکردەوە و هەوڵی دەدا چاکی بکات و منیش هەر وا سەیرم دەکرد. کە لە قازانەکە دوورکەوتمەوە بینیم کە ئەوێ جێی ئەو پارچەیە نییە و دەبێت جێگەیان لەگەڵ پارچەکەی ناوەڕاستدا بگۆڕینەوە. یەک کاتژمێربوو خالّم خەریکیبوو کەچی ئەمەی نەبینیبوو. یەکسەر پێمگوت، سەری سوڕما، چونکە بیست ساڵبوو ئەو کارەی دەکرد و بە مێشکیدا نەهاتبوو سەیری ئەوێ بکات. خالّم ڕووی تێکردم گوتی؛ "ئاسلان تۆ مێشکت زۆر باشە، بەڵام دەستت وێرانە؛ دەبێت کارێک بکەیت کە مێشکی بوێت نەک دەست". دواتر جێگەی پارچەکانمان گۆڕی و کارەکەمان تەواوکرد.

خاڵم منی دەگەیاندەوە ماڵەوە، چونکە زۆر زۆر ماندوو بووبووم. ئەم کارە زۆر قورسبوو، بەڵام ناچاربووم بیکەم. کاتێک خاڵم منی دەبردەوە بۆ ماڵەوە یاڤوز-ی پورزام پەیوەندی پێوە کردم، هاوتەمەنی من بوو و یەک ساڵ لە من بچووکتر بوو، بەڵام بەڕاستی پورزابوو. چاکو چۆنیمان کرد و دواتر مەسەلەی کچ کرایەوە. پێی گوتم کە پلاتفۆرمێکی نوێ لە ئینتەرنێتدا کراوەتەوە و هەر ڕۆژەو کەسێک دەناسێت و ئەمانە. منیش سەرم سوڕمابوو لەو پلاتفۆرمە، شتێکی جیاواز بوو. گوتی؛ "شوێنێکی بڵاوکردنەوەی وێنەیە و بە خێرایی گەورە دەبێت. خێرا هەژمارێک بکەرەوە". نەمدەتوانی بەم تەلەفۆنەی ئێستامەوە بیکەمەوە، بەڵام کاتژمێرییێکی تر فورکان لە کار تەواودەبوو و تەلەفۆنەکەی بۆ دەهێنام و ئەو کاتە دەمتوانی هەژمارێک بکەمەوە، بێگومان دوای کڕینی پاکێجی ئینتەرنێت.

هەموو شتێک بووبوو بە دەرد بۆم. بەهەرحاڵ، گەیشتمەوە ماڵەوە، بێ ئەوەی دایکم ببینم خۆم کرد بە گەرماوەکەدا. سەرەڕی ئەوەی خۆشم شت بەڵام هێشتا دەست و دەموچاوم ڕەش ڕەشبوو هەر نەڕۆیشتبوو. بەهۆی نەبوونی گازی سروشتییەوە دەمێکبوو خواردن لە ماڵماندا لێنەدەنرا، بەڵام ئەمڕۆ بۆنێکی زۆر خۆش لە چێشتخانەکەوە دەهات. دواتر لەبەر ڕووناکی مۆمدا نانێکی خۆشم لەگەڵ دایکم خوارد. خەڵکی مۆم بەکاردەهێنن بۆ دروستکردنی کەشێکی خۆش، بەڵام ئێستا مۆم بووبوو بە بەشێک لە ژیانی ئێمە. لەم دۆخەشدا هەر باسی شتی خۆشم

دەکرد و گاڵتەم لەگەڵ دایکم دەکرد و دەمخستە پێکەنین.

زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا، فورکان هاتبوو تا تەلەفۆنەکەم بداتێ. بە ڕاکردن چوومە خوارەوە، تەلەفۆنەکەم لە فورکان وەرگرت و سوپاسم کرد، پێش ئەوەی بچمەوە ماڵەوە چوومەوە بۆ دووکانی هاوڕێکەم و تەلەفۆنەکەم پێدایەوە و دواتر بەپەلە چوومەوە بۆ ماڵەوە. بەدایکمم نەگوتبوو کە تەلەفۆنەکەمم فرۆشتووە، نازانم ئەگەر پێشتر بە ئێوەم گوتبێت یان نا. بە دایکمم گوت؛ "تەلەفۆنەکەم لەلای وەستابوو و بۆیان هێنامەوە" و نیشانمدا. سیمکارتەکەم کردە ناو تەلەفۆنە نوێکەمەوە و خێرا پاکێجی ئینتەرنێتم کڕی و ئەو بەرنامەیەم دابەزاند کە پورزاکەم باسی کرد و دەستم کرد بە گەڕان بەناویدا. شوێنێکی زۆر سەیربوو. لە ڕێگەی ژمارەی تەلەفۆنەکەتەوە دەتتوانی بچیتە ناو فەیسبووک-دوە و لەوێوە هاورێکانت بدۆزیتەوە. یەکسەر یەک دنیا ئادم بۆ هات. خەڵکی لە تەواوی جیهانەوە وێنەیان بڵاودەکردەوە، زۆر سەیربوو بەلامەوە. لە بەشی هاشتاگەکاندا دەمنوسی ئەنقەرە و یەکسەر هەموو ئەو کەسانەم دەبینی کە لە ئەنقەرەن.

ئادم بۆ ئەو کەسانە دەنار کە دەمویست ببین بە هاوڕێ، لایکی وێنەکانیانم دەکرد و ئەوانیش لایکی وێنەکانی منیان دەکرد و کۆمێنتمان بۆ یەکتری دەنووسی... ئەم بەرنامەیەم بەدڵبوو، سەرقاڵی دەکردم و شوێنێکی باشبوو بۆ کات بەسەربردن. هەم دەشمتوانی هاوڕێی نوێ بناسم. کات درەنگبوو و خەریکبوو خەوم لێدەکەوت، بەلام هێشتا تەلەفۆنەکەمم بەدەستەوەبوو و

خەریکی ئەو بەرنامەیەبووم...

ئێرە بە کورتی باس دەکەم. ڕۆژەکانم هەمووی وەک یەکبوون، هەمیشە تەلەفۆنم بەدەستەوەبوو، بەیانیان دەچووم بۆ سەر کاری چاککردنەوەی قازان، خەریکی تێکۆشانبووم، بەڵام لە لەلایەکی دیکەشەوە هەر خەریکی قسەکردنبووم بە تەلەفۆن، تا ڕۆژێک ژیان چانسێکی دیکەی پێدام، تا ڕۆژێک ژیان پێی گوتم؛ "دەی ئاسڵان!"، تا ڕۆژێک ژیان بەڕوومدا پێکەنی...

لە ڕاستیدا لەدایکبوون ئاسانە، مردن ئاسانە، مانەوە لە ژیاندا ئاسانە. ئەوەی قورس و مەحاڵە ژیان خۆیەتی و بە بەهاترین و بەنرخترین شتی ژیان کاتە. لە بەهاری ژیانمدا هێواش هێواش درکم بەوە دەکرد کە دەبێت کات بەباشی بەکاربهێنم...

دەنگێک لە مێشکمدا گوتی؛ "مادەم کۆتایی ئەم دونیایە هەر مردنە بۆچی هێندە خۆت خەریک دەکەیت پێوەی، خەمدەخۆیت و خۆت پارچە پارچە دەکەیت بۆی؟' نازانم ئەم دەنگە بۆ یارمەتیدانی من بوو یان هۆکارێکبوو بۆ هاندانی من. تۆ بیخوێنەرەوە، بیری لێ بکەرەوە و تۆ پێم بڵێ دۆستم، بۆ کامیان بوو؟

هەموو کەس هەموو شتێک، بۆ شتێک جێدەهێڵێت.

دەکرێت بۆ کاتی بەجێبهێڵێت، بۆ هاوڕێکەی و دۆستەکەی بەجێبهێڵێت، بۆ شانسی بەجێبهێڵێت، تەنانەت دەکرێت بۆ قەدەری بەجێبهێڵێت...

من بۆ خودام بەجێهێشتبوو، چونکە دەمزانی لە سەروو قەدەریشەوە قەدەرێکی دیکە هەیە و هەرگیز ناڕازی نەبووم لە

قەدەر، چونکە دەمزانی هەمووشتێک لە دەستی قەدەردا نییە و کەسێک هەیە کە قەدەر دەنووسێت...

با بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەمان... ڕۆژەکانم هەمووی وەک یەک تێدەپەڕین، تا ڕۆژێک سەیری ئادەکانی ناو بەرنامەکەی ناو تەلەفۆنەکەمم کرد...

لەماڵەوەبووم. ڕۆژی دواتر پشووم بوو. باش بیرم نایە، بەڵام نزیکی کاتژمێر دوو و سێی شەو بوو، دووبارە بەناو ئینتەرنێتدا دەگەڕام وەک ئالودەی تەلەفۆن. هەموو کاتی خۆمم لەوێدا بەفیڕۆ دەدا. سەیری داواکاری هاوڕێیەتییەکانم کرد، تۆ بڵێ چیم بینی؟ یەک دنیا ماڵپەڕی بازاڕکردن ئادیان بۆ ناردبووم، لە سەد و دوو داواکاریدا هەشتا داواکاریی هی ئەو ماڵپەڕانەبوو. لەبەر خۆمەوە گوتم؛ "ئەمە چییە؟ ئەگەر بمانەوێت بازاڕ بکەین خۆمان ئاددتان دەکەین، وانییە؟" و هەموویم سڕییەوە.

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

**لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

وازم لە هیچ شتێک نەهێنا،
بەڵام هەموو شتێکم بۆ خودا بەجێهێشت.
هەرچییەک بێت ویستم بۆ کەسێکی متمانە پێکراوی
بەجێبهێڵم.



## من ئاوا بەرەنگاری شەیتانی خۆم بوومەوە!
## ئێستا کاتی ئەوەیە پشت بە خودا ببەستین

چووم خەوتم، بەیانی کە هەستام تروسکەیەک لەچاومدابوو و ئەو ماڵپەڕی بازاڕکردنانە لە مێشکمدابوو. وەک ئەوەی هێزێکی خودایی هاتبێت و ئەو بیرۆکەیەی خستبێتە مێشکمەوە. هێشتا لە ناو جێگاکەمدابووم کە لەبەرخۆمەوە گوتم؛ "دیاری لە بەرێوەبەرەکان دەکڕم و لێرە دەیانفرۆشمەوە". کە بیرم لێکردەوە لە کارێکی زۆر سەر بە قازانج دەچوو، ئەقڵم گرتبووی، بەڵام هیچ پارەیەک و سەرمایەیەکم لە دەستدا نەبوو. ئەگەر داوای یارمەتیم بکردایە کێ یارمەتی دەدام؟ کاتێک کە بە ڕاستی پێویستم بە یارمەتیبوو کەس نەبوو یارمەتیم بدات، ئێستا کێ یارمەتی ئاسلان-ێکی بێ ئیش و کار دەدات؟ بێگومان کەس یارمەتی نەدەدام...

تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و چوومە ناو بەرنامەکەوە دەستم کرد بە گەڕان، یەک یەک سەیرم کرد بزانم کەس هەیە لەو بابەتانەی من بفرۆشێت. یەک دوو کاتژمێر بەناو بەرنامەکەدا گەڕام، بینیم کە هەموو فرۆشیارەکان هەر بەرهەمی ساختە دەفرۆشن، کەس بەرهەمی ڕەسەنی نەدەفرۆشت. ئەمە هەلێکی گەورەبوو بۆ من، بەڵام دەبوو سەرمایە پەیدا بکەم. فورکان و سێرجان هاتن بە مێشکمدا. ئەگەر یەکی بیست دیارییان لێ وەربگرم و بڵێم "دەیبەم بۆ دوکانی دیارییەکان و دەیفرۆشم." دواتر پێیان

بڵێم "دوکاندارەکە دوای هەفتەیەکی دیکە پارەکەیان دەدات."
لەو نێوەندەدا قازانجێکی زۆر دەکەم، چونکە ئێمە دیارییەکانمان بە نرخێکی زۆر هەرزانتر لە نرخی بازاڕ دەفرۆشت. ئەگەر لە ئینتەرنێتدا بمفرۆشتایە ئەوا قازانجێکی زۆرم دەکرد و وردە وردە سەرمایەیەکم پێکەوە دەنا، بەڵام نازانم فورکان یان سێرجان هێندە چاوەڕێیان دەکرد یان نا.

لە ئینتەرنێتدا شوێنێک نەمابوو سەیرم نەکردبێت لەمبارەیەوە. دەبوو هەموو شتێک بزانم لەوبارەیەوە، دەبوو ئێستا کە کاتم هەیە ئەمەم بکردایە. لەوانەیە ئەمە چانسێک بێت بۆ من، لەوانەیە ژیان بەڕومدا پێکەنیبێت لە کاتێکدا هیچ شتێکم نەماوە بۆ لەدەستدان. لە ئەنجامی بەدواداچوونەکانمدا بۆم دەرکـەوت کە بەڕاستی دەتوانم ئەم کارە بکەم و ئەگەر بە ڕاستگۆییەوە بیکەم دەتوانم زۆر بەرەوپێش بچم تێیدا. دەمتوانی ئەمە بکەم، چیم کەمتربوو لەوانەی دەیانکرد، چیم مابوو بۆ لەدەستدان؟ هیچ شتێکم نەبوو بۆیە غیرەتم پەیداکردبوو.

چەندین کاتژمێر بێ ئەوەی بێمە دەرەوە لە جێگاکەم، بەناو ئەم بەرنامە و ئەو بەرنامە، ئەم ماڵپەڕ و ئەو ماڵپەڕدا گەڕام و بڕیارمدا کە دەبێت من ئەم کارە بکەم. ئێستا سەرەی پەیداکردنی سەرمایە بوو. لەو کاتەدا مامێکم دۆخی دارایی باشبوو، بەڵام ئەگەر من پەیوەندیم پێوە بکردایە هەرگیز پارەی نەدەدامێ بۆیە دەمویست بەدایکم بڵێم پەیوەندی پێوە بکات. لە سەرەتادا ئەو شوێنەم دیاریکرد کە دیارییەکانی لێ دەکڕم و دواتر چووم تا

قسە لەگەڵ دایکم بکەم. باسی کارەکەم بۆ کرد لە سەرەتاوە تا کۆتایی، ئەویش گوتی؛ "دەتوانیت بیکەیت کوڕم، دەزانم دەتوانیت. تاکە ئومێدم تۆیت." دواتر گوتی:

"ئیتر تۆ بە باوکی ئەم خێزانە دادەنرێیت، ئەگەر تۆ بکەویت ماڵەکەش دەکەوێت، ئەگەر تۆ بکەویت دایکیشت دەکەوێت، ئەگەر تۆ بکەویت براکەشت دەکەوێت... بۆیە مەکەوە کوڕم، هەرگیز مەکەوە. دەزانم ئەم بارە قورسە بۆ تۆ، بەڵام بزانە خودا لەگەڵتە و لەبیری مەکە کە خودا هیچ بارێک ناخاتە سەر شانی کەسێک نەتوانێت هەڵیبگرێت"

هەرگیز ئەم وتانەی دایکمم لەیاد ناچێت، خودا هیچ بارێکی نەدەخستە سەر شانی کەسێک کە نەتوانێت هەڵی بگرێت و ئەمەش بووبووە مایەی شانازی من. پێشتریش گوتم کە دیارە بەهێزم بۆیە خودا ئەم ئەرکەی بە من داوە. دایکم پەیوەندی بە مامەوە کرد و داوای بڕە پارەیەکی کەمی لێکرد بە قەرز، بەڵام مامم گوتی؛ "نەخێر".

ئومێدەکانم ڕووخابوون، بەڵام نەدەبوو هەرگیز کۆڵبدەم. ئەو کاتە دەتتوانی تەلەفۆن بە قیست بکڕیت، ئێستاش هەیە، بەڵام ئەو کاتە تازە پەیدا بووبوو. ئەو تەلەفۆنەم دەکڕی، دەمفرۆشتەوە و پارەکەیم دەکردە سەرمایە بۆ کارەکەم و بە قیست پارەکەیم وردە وردە دەدایەوە، مەڵێن کێ متمانە بە ئاسلان-ی بێ ئیش و کار و قەرزار دەکات؟ خودا کەسێک هەر دەنێرێت. برا گەورەیەکی باشم هەبوو ناوی کاکە یالچن بوو، پیاوێکی پیاوانە بوو، هەرچەندە

خۆشی باری دارایی زۆر باش نەبوو، بەلام هەمیشە هەولی دەدا یارمەتیم بدات. جار جار پەیوەندی پێوە دەکردم و حاڵ و ئەحواڵی دەپرسیم. دەریدەخست کە چەنێک دەیەوێت یارمەتیم بدات، بەس هیچی لەدەست نەدەهات. پەیوەندیم بە کاکە یالچن-ەوە کرد و دۆخەکەم بۆ باس کرد. خوا لێی ڕازی بێت یەکسەر گوتی؛ "ئەگەر بە منی دەدەن ئەوا با یەکسەر بچین بیکڕین براکەم".

خودا دەرگایەکی کردەوە بەڕوومدا تا ئەم کارە سەر بگرێت. هەر هەمان ڕۆژ لەگەڵ کاکە یالچن-دا چووین بۆ دوکانێکی تەلەفۆن، تەلەفۆنەکەیان پێ فرۆشت. بەلام کاتێک پارەکەیمان دەکرد بە قیست بڕێکی زۆر دەردەچوو و کە دەمانفرۆشتەوە زەرەرێکی زۆرمان دەکرد. کاکە یالچن سەیرێکی کردم و گوتی؛ "کوڕم دەتوانیت پارەکەی بدەیت، ئەگەر پێت نەدرا من بۆت دەدەم، دەزانم ئەم ئیشەت سەردەگرێت، مەترسە. مادەم تا ئێرە هاتووین ئەوا خودا ئەم ئیشە سەردەخات." و ڕووی کردە تەلەفۆنچییەکە و گوتی؛ "باشە، پەڕاوەکان بێنە با واژۆی بکەم".

هەر کە تەلەفۆنەکەمان وەرگت بە ڕاکردن چووین بۆ فرۆشتنی. فرۆشتمان و پارەکەیمان وەرگرت. لەچاو نرخی کڕینی تەلەفۆنەکەدا پارەکەی هێندە زۆر نەبوو کە بیرم لێ دەکردەوە، بەلام ئەمە هەلێکی گەورەبوو بۆ من. هەلێک، چانسێک و نیعمەتێکبوو بۆ دایکم، براکەم و خێزانەکەم. وەک منداڵ دڵخۆشبووم و دەست و قاچم دەلەرزی لە خۆشیدا. پەیوەندیم بەو کەسەوە کرد کە دیارییەکانم لێ دەکڕی و لەگەڵ کاکە یالچن-

دا چووین و دیارییەکانمان هێنا، لە ئێستادا ڕێک حەڤدە دیاریم پێبوو، کاتێک ئەمانەم دەفرۆشت دەمتوانی سێ و چوار دانەی تر بکڕم، بەڵام بێگومان نەمدەتوانی ئەوەندە بکڕم، چونکە لەو ماوەیەدا پارەمان دەویست بۆ بژێوی. هەرچەندە بڕە پارەیەکی کەمم پێبوو، بەڵام لە سەدا سەد قازانجم دەکرد واتە؛ بە پەنجا شەست لیرە دەمکڕین و بە سەد و دە یان سەد و بیست لیرە دەمفرۆشتنەوە. ڕاستە هێشتا هیچم نەفرۆشتبوو، بەڵام خەیاڵ و پلانەکانم ئاوابوون. خەڵکی ئەم دیارییانەیان هەڵدەبژارد، چونکە نرخیان لە بازاڕدا نزیکەی دوو سەد بۆ دوو سەد و پەنجا لیرەبوو. لەگەڵ کاکە یالچن-دا گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و لە ڕێگا هەر باسی ئەم کارەمان دەکرد. لەو ساتەدا وا هەستم دەکرد قاسەی بانقێکم پێیە نەک جانتایەک دیاری. ئەمە بە کەم مەزانن، مەڵێن؛ "هەر حەڤدە دیاریی هیچە"، بەردەوام بن لە خوێندنەوە...

زۆر سوپاسی کاکە یالچن-م کرد و پێمگوت؛ "خەمت نەبێت کاکە بە زووترین کات پارەکەت دەدەمەوە" و ماڵئاواییمان لەیەک کرد و چوومە ژوورەوە. هەر کە چوومە ژوورەوە یەکەم شت پەیجێکی فرۆشتنم کردەوە. هەژماری کەسی خۆمم وەلانابوو و خەریکی پەیجەکەبووم، لە ژوورەکەمدا دانیشتبووم و هەر خەریکی ئادکردنی خەڵکبووم و وێنەی دیارییەکانم بڵاو دەکردەوە و لە ژێریاندا بە گەورەیی دەمنووسی "١٠٠٪ ئۆرجیناڵە"، دەچووم سەیری پەیجی دیکەم دەکرد، هەوڵم دەدا بە لاساییکردنەوەی ئەوان فێری کارەکە ببم. پێویستم بە کاتبوو تا متمانەی خەڵک

بەدەستبهێنم و دەست بکەم بە فرۆشتن چونکە پەیجەکەم هیچ فۆلۆوەرێکی نەبوو. بۆ زیادکردنی فۆلۆوەرکانم نامەم بۆ هاورێکانم دەنارد و دەمگوت؛ "ئەمە کارە نوێکەمە، ئادم بکەن"، بەبێ وەستان ئادی خەڵکی نەناسیاوم دەکرد، لایکی وێنەکانیانم دەکرد و هەوڵم دەدا سەرنجیان ڕابکێشم، بە کورتی پەیجەکانیتر چیان لە من کرد منیش هەموویم کردەوە بێ ماندوبوون و بێ خەوتن. بێ وەستان چیم لە دەست دەهات دەمکرد. خەریکبوو سەری دەگرت، دەبوو سەر بگرێت...

هاورێکانم یەک یەک ئادیان کردم، خوشکەکەم و پورزاکانم لە هەژماری خۆیاندا پێشنیاری پەیجەکەمیان کردبوو، هاورێکانم دەستیان کردبوو بە بڵاوکردنەوە. ئەو کاتە فەیسبووک بەناوبانگترین پلانتفۆرمبوو، لەوێوە ڕێکلامم دەکرد. زۆرم لە خەڵک دەکرد و دەمگوت؛ "ئادم بکەن"، "بڵاوی بکەنەوە"... خاترم لای کێ هەبوایە بەکارم دەهێنا. تا ڕۆژی دواتر ئاوا بەردەوامبووم. ڕۆژی دواتر لەگەڵ خاڵم چوومەوە بۆ چاککردنەوەی قازان بۆیە لەو ماوەیەدا نەمتوانی ئاگام لە تەلەفۆنەکەم بێت. ڕۆژەکانم ئاوا تێدەپەڕین. دە ڕۆژ تێپەڕی و هێشتا یەک شتیشم نەفرۆشتبوو. ئیتر خەریکبوو خەیاڵەکانم دەڕوخان و ئومێدم لەدەست دەدا. بۆ ئەو کارەی گوتم؛ "سەردەگرێت، دەبێت سەر بگرێت" چیتر دەمگوت؛ "سەر ناگرێت".

خودایە هێز و سەبرم بدەرێ، چیم لەم هەموو قەرزە بکردایە؟ ئەوە قەرزی تەلەفۆنەکەشی چووە سەر. ئەگەر دیارییەکانم

ببردایە بۆ دوکانی دیارییەکان بە نرخی خۆی لێی دەکڕیمەوە، بەڵام ئەوەش بەشی نەدەکردم. دیسان هەموو شتێکم تێکدایەوە؟ لە چاککردنەوەی قازانیشدا زۆر خراپبووم. کاتێک بیرم لەمانە دەکردەوە خالّم هاواری کرد و گوتی؛ "دەرنەفیز، ئاسلان دەرنەفیزم بدەرێ، دەرنەفیزا!" گوتی کە زیاتر لە دە جار دووبارەی کردۆتەوە، بەڵام هیچ ئاگام لە خۆم نەبوو. دە ڕۆژ تێپەڕیبوو و هێشتا هیچم نەفرۆشتبوو، بەڵام ژمارەی فۆڵۆوەرەکانم چوار سەدی تێپەڕاندبوو. لە چوار سەد کەسدا یەکێکیش شتێکم لێ ناکڕێ؟ ئەها گوتم شانس بەڕوومدا پێکەنی، ئەوەتا هەر ئەوەندە پێکەنی، بەڵام خێرێکی هەر تێدایە...

فورکان و سێرجان پەیوەندیان پێوە دەکردم، بەڵام وەڵامم نەدەدانەوە، چونکە ئەگەر دیارییەکانی خۆمم بفرۆشتایە ئەوا دیارییەکانی ئەوانیشم بۆ خۆم هەڵدەگرتەوە، بەڵام هێشتا یەک دانەشم نەفرۆشتبوو. دیسان شکستم هێنا، دیسان شکستم هێنا...

"کاتێک بێ چارە دەبم،
دەچم وەستایەکی بەرد دەدۆزمەوە و سەیری دەکەم.
لەوانەیە سەد جار بکێشێت بەو بەردەدا
بەڵام نەک هەر بۆی ناشکێت،
بەڵکو درزێکی بچووکیشی تێنابێت.
دواتر لە پیاکێشانی سەد و یەکەمیندا،
بەردەکە دەبێت بە دوو لەتەوە.
ئەو کاتە تێدەگەم کە کۆتا پیاکێشان بەردەکەی نەشکاندووە،
بەڵکو ئەوانەی پێش ئەو شکاندوویانە."
-جاکۆب ڕیس

ئـەم وتـەیـە هـات بـە مێشکمدا، بیـرم نـایـەت لـە کوێش خوێندوومەتەوە، بەڵام پێویستم بەم شێوازی بیرکردنەوەیەبوو. نەدەبوو بوەستم و کۆڵ بدەم، هەمیشە ئەو ڕستەیەی دایکم لە گوێمدا دەزرنگایەوە کە گوتی؛ "کوڕم تۆ بکەویت ماڵەکەش دەکەوێت". توانیم دووبارە ئومێدی ناو دڵم بژێنمەوە...

ئێـواران بە هیلاکی دەڕۆیشتمەوە بۆ مـاڵـەوە و دووبـارە دەستم دەکـردەوە بە لایک کـردن و ئادکردن بێ وەسـتان. لە چوار سەد کەسدا کەس هیچی نەکڕی و لە حەوسەد کەسیشدا کەس نەیکڕی. ڕۆژان تێپەڕین، دووبارە کاتی پارەدانی کارەبا و گازی سرووشتی هاتەوە، کاتی کرێش نزیکبووبوەوە. خەریکبوو ئاویشمان نەدەما. نەوەستام و بە هیچ جۆرێکیش نەدەوەستام، ئەگەر ئەم کارە لەناویشی ببردمایە هەر نەدەوەستام. هەر وەک گوتم ڕۆژەکانم هەمووی وەک یەکبوون و هیچ کارێک نەمابوو نەمکردبێت. متمانەم بە خودا دەکرد و ئیتر کارەکەم بۆ خودا بەجێهێشتبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم ڕستەیە بهێنێتەوە یادم؛ "کوڕە ئاسلان، تۆ هەمیشە بە خۆت نالێی 'کاتێک ئیشتێک بۆ خودا بەجێهێشت وابزانە بووە.'؟" ئەم ڕستەیە وای کرد بە باشی بیر بکەمەوە لە کاتی بێچارەییمدا.

بەڵێ هەمیشە وام دەگوت، ئێستاش هەموو ئەوەی لەدەستم هاتبوو کردووم، هەم لەڕووی مادییەوە هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە. نزاکەشمم کرد، ئیتر جگە لە نزا هیچیترم لە دەست نەدەهات، هەرچییەکم کرد هەر سەری نەگرت. هەفتەیەکی تریش تێپەڕی،

ژمارەی فۆلۆوەرەکانم هەزار و پێنج سەد کەسی تێپەڕاندوو. هەروەها لەو ماوەیەدا یەک دوو جار دیارییەکانم هەڵگرت و بردمن بۆلای هاوڕێکانم و بە ناو فەرمانگە حکومییەکاندا گێرامن، بەڵام دیسان هیچم نەفرۆشت. بەردەوامبووم لە کاری قازان لەگەڵ خاڵمدا و کاتی یەکەم قیستی تەلەفۆنەکە نزیک بووبووەوە. ئەو مووچەیەی لە خاڵمم وەردەگرت ئەوەندە زۆر نەبوو بەشی ئەوە بکات کە پارەی قیستەکەی لێ بدەم، تەنها بەشی کرێ و پارەی کارەبای دەکرد، پارەی جگەرەی خۆشمم پێنەدەما. هێشتا سوپاسی خودا دەکەم کە دەست و قاچم کار دەکات و تەندرووستم، بەڵام بەڕاستی بە کاتی سەختدا تێدەپەڕیم و خێزانەکەشم لە هەمان دۆخدابوو، بەڵام دایکم لە هەمووان زیاتر سەختی دەچەشت. هەم مێردەکەی ڕۆیشتبوو، هەم کوڕێکی لە سەربازی بوو، حەسرەتی ئەویشی دەچەشت و ئەم سەختیانەشی دەچەشت، بەڵام هێشتا لە من بەهێزتربوو، نازانم بەهۆی تەمەنییەوەبوو یان بەهۆی باوەڕییەوە.

دەمزانی شتێک دەبێت، شتێک دەبێت تا هەڵمسێنێتەوە سەر پێ... هەر هەستامەوە دەتوانم ڕابکەم، لە دۆخێکدابووم کە ڕێگرییەکی زۆر بچووک لەبەردەممدابوو کە دەبوو تێیبپەڕێنم، بەڵام من نەمدەتوانی هەنگاویش بنێم. خۆزگە یەکێک دەهات و لە دواوە شەقێکی تێهەڵدەدام و دەیخستمە ئەودیو ڕێگرییەکەوە، لەوێوە هەڵدەستامەوە و ڕامدەکرد. بەس هێزی تێپەڕاندنی ئەو ڕێگرییەم هەبوایە، یەکێک یارمەتی بدامایە، ئەگەر بە شەقیشبوایە،

بە مشتەکۆڵەشبوایە و بە پاڵنانیشبوایە هەر ڕازیبووم... بەس یەکێک یارمەتی بدامایە خۆم ئەوەیتریم چارەسەر دەکرد.

وامدەزانی هەموو ڕۆژێکم هەر وا دەڕوات و خەمم دەخوارد. هەنگاوم دەنا، بەڵام نەمدەزانی بەرەو کوێ دەڕۆم. دەبێت هەر چۆنێک بێت ئێرە تێپەڕێنم. پێویستم بە شوێنێکبوو کە بڵێم "ئەوەتا لێرەوە قەدەرم گۆڕا" بەڵام شوێنێکی وا نەبوو هاوڕێ. زۆر هەستێکی ناخۆشە کاتێک هەست دەکەیت مردوویت و ڕۆحت ناژی. لە دۆخێکدام کە ڕۆژەکان لە شەوەکان خێراتر تێدەپەڕن، شەوان هیچ کاتم لێ ناڕوات. دەڵێن "مرۆڤ شەوان زیاتر خەم دەخوات"، ڕێک وایە، چونکە بە ڕۆژ خەریکی تێکۆشانیت بۆ ژیان و کاتت نییە بۆ بیرکردنەوە. شەوان بە تەنها لەگەڵ دەردەکانتدا دادەنیشیت، هەتا دێت زیاتر بیریان لێدەکەیتەوە و خەمیان لێ دەخۆیت. بۆیە شەوان خەمناکترن بۆ هەموو کەسێک...

بابگەڕێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان... دیسان لەسەر کاربووم، واتە لەگەڵ خاڵم خەریکی چاککردنەوەی قازان بووین، زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا، کڕیارێکبوو. بەڵی بەڵێ، ئەمە یەکەم کڕیارمبوو! نازانم چۆن باسی ئەو خۆشییەمتان بۆ بکەم، لە ناکاو هەموو ئومێدەکانم بووژانەوە. یەکەم فرۆشتنم بوو، یەک دانەش نەبوو بەڵکو بە یەک جار حەوت دیاریم فرۆشت. نەمدەتوانی باوەڕبکەم. خاڵمم بەجێهێشت و چوومە دەرەوە. گەنجێکی خۆڵاوی و قوڕاوی لەسەر شەقامێکی بەناوبانگ بە تەلەفۆن قسەی دەکرد و لە خۆشی یەکەم فرۆشتنیدا هەڵدەپەڕی. لەو کاتەدا هەمووان سەیری منیان

دەکرد و من هەر هەستیشم پێ نەکردبوو. هەموو کەس چاوی لەسەر من بوو، چونکە جلەکانم زۆر پیسبوون، بەڵام کێ گرنگی بەمە دەدات؟ من خەریکی یەکەم فرۆشتنم بووم، یەکەممم...

بە تێپەڕبوونی کات نامە و پەیوەندییەکان زیادیان کرد. ڕۆژێک پەیجێک نامەی بۆ ناردم و گوتی؛ "با پەیجی یەکتری بڵاو بکەینەوە، ژمارەی کڕیارەکانمان زیاد بکەین". دوای ئەوەی پەیجی یەکتریمان بڵاوکردەوە ئەو بیست فۆڵۆوەر زیادی کرد منیش سەد و پەنجا فۆڵۆوەرم زیادیکرد. منیش دوای ئەوەی فێری ئەمە بووم بێ وەستان نامەم بۆ هەموو پەیجی فرۆشتنەکان نارد و دەمگوت؛ "با پەیجی یەکتر بڵاو بکەینەوە، کڕیارەکانمان بەش بکەین و هەردووکمان کار بکەین." و بە دڵنیاییەوە یەک لەسەر چواری ئەوانەی نامەم بۆ دەنارد ڕازی دەبوون. پەیجی یەکترمان بڵاو دەکردەوە و فۆڵۆوەرمان بۆ یەکتر دەنارد.

ئەو فۆڵۆوەرانەی لە ماوەی سێ هەفتەدا بە زۆر کردمن بە هەشت سەد کەس، لە ماوەی هەفتەیەکدا گەیشتە پێنج هەزار کەس. لەو ماوەیەدا هاوڕێیەکم ناسی بە ناوی کاکە حوسەین و ئەو زۆر یارمەتیدام چونکە ئەو پەیجێکی زۆر گەورەی فرۆشتنی تایبەت بە خۆی هەبوو و منیشی خۆشویستبوو و یارمەتی دەدام. لە کاتێکدا کە پێشتر بە سێ هەفتە یەک جار شتم فرۆشت، لەم هەفتەیەدا چوار کڕیاری ترم بۆ هات. گەورەترین هۆکاری ئەم پەرەسەندنەم کۆڵنەدانم و یارمەتی خودا بوو لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوە.

له بێبەزەییترین ڕۆژەکانی ژیاندا
چاوەڕێی یەک دەنگ دەکەیت،
دەتەوێت کەسێک دەستێکت بۆ درێژ بکات،
چاوەڕێی یارمەتی دەکەیت، بەڵام هیچیان نایەن.
هەرچەندە دەشزانیت نایەت،
بەڵام هەر چاوەڕێ دەکەیت.



**ئیتر هێندە پێویستم بەڕووداني شتی خۆشبوو... لەو کاتەدا منداڵەکەی ناخم هەستا و گوتی؛ "دەی. دەی بەرەو ڕۆژی خۆش..."**

هەموو ڕۆژێک سێرجان پەیوەندی پێوە دەکردم، بەڵام وەڵامم نەدەدایەوە. کە وەڵامم نەدەدایەوە نامەی دەنارد. جار جار وەڵامی فورکان-م دەدایەوە و دەمگوت؛ "باشم کاکە، هەموو شتێک باشە. من پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە." بەڵام هیچ وەڵامی سێرجان-م نەدەدایەوە. دەبوو کەمێک چاوەڕێ بکەن، چونکە نەمدەویست لە ئێستادا دیارییەکانیان بفرۆشم بە دوکانی دیارییەکان، بەڵکو دەمویست خۆم پارە کۆبکەمەوە و لێیان بکڕمەوە. دەبوو پارەی زیاتر پەیدا بکەم و زیاتر کار بکەم. دیارییەکانم تەواو بووبوو، دەبوو کەسێک پەیدا بکەم تا دیاری لێ بکڕم. لە ئینتەرنێتدا گەڕام بزانم دەتوانم لە کێی بکڕم، بەڵام کەسم دەستنەکەوت، چونکە هەمووان بەرهەمی ساختەیان دەفرۆشت. من هەرگیز بەرهەمی ساختەم نەدەفرۆشت، ئەمە گەورەترین بەڵێنبوو کە بە خۆمدابوو. فرۆشتنی بەرهەمی ساختە قازانجی زۆر زیاتربوو، بەڵام هەڵخەڵەتاندنی خەڵک لە من نەدەوەشایەوە.

یاریدەدەرێکی بەڕێوەبەرم دۆزییەوە و کەمێک دیاریم لێکڕی، هەر ئەوەندەی پارەکەم بەشی دەکرد. دەبوو سەرمایەیەک پێکبهێنم بێ ئەوەی پارەی کارەبا، کرێ و براکەم بدەم. دوای فرۆشتنی

ئەمانە پارەی پسوڵەکان، کرێ، براکەم، قەرزی تەلەفۆنەکە و هەموو شتێکم بە ڕیز دەدایەوە، بەڵام دەبوو کەمێک زیاتر بفرۆشم. زۆر دەترسام لەوەی پارەکەمم لەدەست بچێت، یان بەرهەمی ساختەم پی بفرۆشن لە جێی ئۆرجینال، بیرم لە هەموو شتێک دەکردەوە بەس مێشکم بەقەدەر دەردەکانم گەورە نەبوو، بەڵام خودا لە هەموو شتێک گەورەترە و دەمزانی کە ئەو لەگەڵمە. بەردەوامبووم لە گەورەکردنی پەیجەکەم. کەسانی دەورووبەرم، هاوڕێکانم و ناسیاوەکانم ئیتر کە پەیجەکەیان دەبینی نامەیان دەنارد، پرسیاریان دەکرد و دەیانویست بەرهەمەکان بکڕن. تێگەیشتم کە متمانە لەم کارانەدا شتێک نییە لە ناخی دڵەوە بێت، بەڵکو پەیوەندی بە پۆستەوە هەبوو. ئەگەر پەنجا سوێندیشم بخواردایە کە ساختە نییە خەڵکی زیاتر ئارەزووی بینینیان دەکرد.

دەستم کردەوە بە پەیوەندیکردنەوە بە کەسانی دەورووبەرمەوە. لە گەڕەکەکەماندا کاکە موکەڕەم هەبوو. بە تەمەن لە من گەورەتربوو و لە فەرمانگەیەکی حکومی لە پۆستێکی زۆر باشدابوو. چووم بۆلای ئەو و بۆم باسکرد و گوتم؛ "ئیتر ئاوایە کاکە، دەمەوێت بێم و لە فەرمانگەکەی ئێوە بەرهەمەکانم بفرۆشم." ئەویش گوتی؛ "باشە، من دەبم بە کەفیلت. تۆ باش دەناسم، لە ڕێی منداڵەکانیشەوە کەم کەم ئاگادارم پێنج ساڵە چەند دەردت هەیە." و براگەورەیی خۆی نواند، بەڵام ئەو فەرمانگەیە زۆر گەورەبوو بۆیە دەبوو کە ڕۆیشتم بۆ ئەوێ دیاری زۆرم پێبێت و ئەمانە هەرگیز بەشی نەدەکردم، چونکە دەبوو

هەڵبژاردەی جیاواز بخەمە بەردەستی خەڵکەکە. کاکە موکەڕەم گوتی؛ "بەس لە نهۆمەکەی ئێمەدا چل کەس هەیە، دەتوانیت نیشانی هەموویانی بدەیت، ئەگەر لێت بکڕن بڵاوی دەکەنەوە. دواتر هەموو فەرمانگەکە لێت داوا دەکات چونکە مارکەن. هەموو کەس ئارەزووی بەرهەمی هەرزان دەکات".

کاکە موکەڕەم ڕاستی دەکرد، مرۆڤەکان ئارەزووی بەرهەمی مارکەیان دەکرد، بەڵام زۆر گرانبوون، لە ڕاستیدا ئێمە هەلمان دەبردە بەر پێیان، بەڵام کێشەکە متمانە و پۆستبوو. هێواش هێواش فێری بازرگانی دەبووم. لە ڕاستیدا فێری فرۆشتنی خێرابووم نەک بازرگانی، چونکە ئەمە لە کاری فرۆشگا کۆنەکەم نەدەچوو، لەوێ کڕیارێک دەهات و دەیگوت فلان مارکەم دەوێت و منیش نیشانم دەدا، بیکڕیایە باشبوو نەشیکڕیایە کێشە نەبوو کڕیارێکی دیکە دەهات و دەیکڕی، بەڵام ئێستا وا نەبوو. ئێستا ڕاستەوخۆ گرنگیان پێ دەدەم، خزمەتگوزاریان پێشکەش دەکەم و هەموو شتێک دەکەم تا ئەو بەرهەمە بکڕن. دەبوو بە زووترین کات دیارییەکانی بەردەستم بفرۆشم تا بتوانم هەموو دیارییەکانی فورکان و سێرجان بکڕم. دەبوو ئیتر واز لە کاری قازانەکە بهێنم و زیاتر گرنگی بەم کارە بدەم، چونکە ڕۆژی دە کەس نامەی بۆ دەناردم. قسەم لەگەڵ خالَم کرد و داوای پارەکەمم کرد و پێمگوت کە ناتوانم ئەم کارە بکەم و واز لە کار دەهێنم، خاڵیشم خوا لێی ڕازیبێت وەڵامێکی ناخۆشی دامەوە و گوتی؛ "کوڕم قسەی بێ مانا مەکە، ئیشی وا چۆن دەبێت؟ تۆ هەرگیزاو هەرگیز

سەرکەوتوو نابێت، ئەم ئیشە سەرناگرێت. شتی وام نە بیستووە نە بینیوە." بەڵام چاکی کرد، باشبوو وای کرد، کە خاڵ و مامم بینی ئەوا زیاتر گوژمم خواردەوە و ڕووبەڕووی ژیان بوومەوە. بە دڵنیاییەوە لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبووم. هەر وەک دایکم گوتی؛ ئەگەر من بکەوم ماڵەکەش دەکەوێت!

چیتر ڕۆژەکانم بە تەلەفۆنکردن و نامە ناردن و بردنی دیارییەکان بۆلای هاوڕێکانم و هەوڵدانی فرۆشتنیانەوە تێدەپەڕین. دڵنیابە کە بیرم لە دوو لیرەش دەکردەوە. کاتێک پێویستبوو سەر پاس بکەوم، سەر نەدەکوتم و بە پێ دەڕۆیشتم. دەبوو جگەرە بکڕم و نەمدەکڕی. یەک لیرە یەک لیرەبوو و هەرگز ئەو ڕۆژانە لە یاد ناکەم کە پێویستم بەو یەک لیرەیەش بوو. پێشتر پارەم تەخشان و پەخشان نەدەکرد، هەرگیز هێندە پارەم پێنەبوو تا بتوانم ئاوا بکەم، بەڵام هەڵەی زۆرم کردبوو و بەو هەڵانەی خۆمم زانیبوو. ئەو هەڵانە ڕوویەکی زۆر جوانیان هەبوو، فێریان کردم دووبارەیان نەکەمەوە و نیشانیان دام کە چەن بە زیانن. هەرچەندە لەو کاتەدا منیان زۆر ماندوو کرد، بەڵام بەهێزتریشیان کردم تا دووبارەیان نەکەمەوە.

فێربوونی وانە لە هەڵەکانمەوە بووبوو بە بەشێک لە من و هەموو شێوازی بیرکردنەوەم لەسەر دەرهێنانی وانە لە هەڵەکانمەوە هەڵچنیبوو. هەموو شتێک ناڕوون بوو لەلام. مێشکم زۆر تێکەڵبوو، هەموو شتێک تێکەڵبوو، ئاراستەکردنی داهاتووم سەختبوو، بەڵام متمانەم بە خودا هەبوو. هێشتا ئەو کاتانەم بیربوو

کە فرمێسک لە چاوەکانم دەباری. نەمدەزانی باجی هەڵەکانم داوە و ئاسوودەبووم یان نا، لە هیچ شتێک دڵنیا نەبووم. ئەم وتەیە هاتەوە یادم کە لە ئەڵقەیەکدا بینیبووم چونکە دەمزانی هەنگاوم ناوەتە ناو ژیانێکی نوێوە و چانسێکی نوێم پێدراوە. ئەو ڕێگرەم تێپەڕاندووە ئیتر...

هەموو کەس ژیانی دووەمی وەک چانسێکی نوێ دەبینێت
بەڵام ئاوا نییە...
کەس پێشتر پێتناڵێت کە
بۆ ئەوەی دەست بە ژیانی نوێ بکەین
یان دۆستەکانت پشتت تێدەکەن
یان تۆ پشت دەکەیتە ئەوان...
کەس باسی ئەو کاتە ناکات کە ڕاستەکان تێکەڵی هەڵەکان دەبن.
کەس باسی ئەو کاتە ناکات کە هەر کەسەو بەلایەکدا بڵاودەبێتەوە،
کردەوەکانی خۆمان هێلانەکەی خۆمان دەلەرزێنێت.
کاتێک دێت کە دۆستەکانت بێ ماڵئاوایی بەجێتدەهێڵن،
چەک دەدرێتە دەست بێتاوانەکان،
دنیات بەسەردا هەڵدەگەڕێنرێتەوە.
هاوڕێ، بەدەستهێنانی چانسی دووەم،
بە واتای لە دەستدانی چانسی یەکەم دێت.
بەواتای دۆڕاندن دێت کاتێک خەریکە دەیبەیتەوە.

ژیانی دووەم،
ژیانی دووەم، بە واتـای ئـەوە نایەت کە لەژیانی یەکەمدا خیانەتت لێ کرابێت،
بەڵکو واتا خیانەتت لە ژیانی یەکەمت کردووە.
هەموو کەسێک باسی چانسی دووەم دەکات بەڵام
کەس هەر نایەوێت بیری بێتەوە کە چۆن
لە دەرگای خراپەوە چۆتە ژوورەوە.
تەمەنێک هەیە لە ژیانی یەکەم و ژیانی دووەمدا.
هیچ شتێک تەواو نابێت،
بەڵام هەموو شتێک دەگۆڕێت!"

منیش ئـاوام بەسەرهاتبوو. هەموو شتێک دەگـۆڕا، بەڵام هیچ شتێک تـەواونـەدەبوو و ئـازارم دەچەشت، چونکە ترسی لەدەستدانی ئازیزەکانم منی دەتواندەوە، ژانی دەخستە دڵمەوە و دڵمی پارچە پارچە دەکرد...

بە خۆمم دەگوت؛ "ئاسڵان، تۆ ناوت ئاسڵان-ە، هەموو ناوێک مانای خۆی هەیە و مانای ناوەکەی تۆش شێرە، بۆیە مەوەستە و بەردەوامبە". تاکە دڵدەرەوەم ئەوە بوو بیدەم بەست قەدەرەوە و تاکە چارەشم یاخیبوون بوو لە قـەدەر. کە دەڵێم یاخیبوون مەبەستم لە سەرەڕۆیی نییە تەنها چاوەڕێبووم خودا بە نزاکانم قەدەرم بگۆڕێت...

جوانترین سوودی تەنیاییم ئەوەبوو کە فێری کردم زیاتر هانا ببەم بۆ خودا، چونکە بە تێپەڕبوونی کات فێربووم هەموو کەسە ئازیزەکانم لە خۆم دووربخەمەوە، چونکە دەبوو هەموو کارەکانم بەتەنها بکەم. ئایا کەسێکی تەنها باسی تەنهایی خۆی بۆ کەس دەکات؟

ڕۆژان تێدەپەڕین و بە تێپەڕبوونی کاتیش پەیجەکەم گەورەتر دەبوو و شتی زیاترم دەفرۆشت. دەمێکبوو کاتی ئەوە هاتبوو ژیانم ڕێک بکەمەوە و پسوڵەکان چارەسەر بکەم. دڵخۆشی ئەو کاتەی دایکم هێشتا لەبەرچاومە، کە نزای دەکرد، بە پێکەنینەوە دەیگوت؛ "بەخێربێیتەوە کۆڵەکەیماڵەکەم"...

هەرگیز نەمگوتووە منداڵییەکی خۆشم بەسەربردووە، بەڵام ئەو ئازارەی منداڵییم هەمووی ئامادەکارییبوون بۆ گەنجێتیم و من پێمنەزانیبوو. وردە وردە کارەکانم کەوتنە سەر سکە، کەم کەم پارەم پەیدا دەکرد. هەروەک پێشتر باسم کرد، دەمویست دیارییەکانی فورکان و سێرجان بکڕمەوە، دەبوو قسەیان لەگەڵ بکەم لەمبارەیەوە، بەڵام دەبوو کەمێک زیاتر پارە کۆبکەمەوە. جانتایەکی گەورەم دەگرت بە دەستمەوە، پڕم دەکرد لە دیاری و دەمبرد بۆ فرۆشتن. سەر پاس دەکەوتم و دەگەڕام. لە دەرەوە نانیشم نەدەخوارد، ئەگەر زۆرم برسی ببوایە سمیتێکم دەخوارد. هەرچەندە پارەشم پێبوو، بەڵام نەمدەتوانی خەرجی بکەم، دەبوو کۆی بکەمەوە. دەمزانی دووبارە لە تاقیکردنەوەیکدام، خودا منی تاقی دەکردەوە. دەیگوت؛ "با بزانین ئاسلان چی دەکات کاتێک

پارەی دەست دەکەوێت؟ ئەم پارەیە بۆ کاری باش بەکاردەهێنێت یان خراپ؟"

ئەو کاتە لەو پلاتفۆرمەدا کچێکیشم ناسی. نامەم بۆ دەنارد و قسەمان دەکرد و جار جار یەکمان دەبینی و دەگەڕاین. وردە وردە ژیانمم خستبووەوە سەر سکە. کارەکانم بەرەوپێش دەبرد. بە بڵاوکردنەوەی پەیجی یەکتر لەگەڵ پەیجەکاندا ژمارەی فۆڵۆوەرەکانم بیست هەزار کەسیان تێپەڕاندبوو. دەمێکبوو ژمارەی ئەو کەسانەی ڕۆژانە نامەیان دەنارد و تەلەفۆنیان دەکرد گەیشتبووە شەست حەفتا کەس. پەیوەندیم بە فورکان و سێرجان-ەوە کرد و پێمگوتن دیارییەکانیان دەبەم بۆ دوکانی دیارییەکان. دیارییەکانم لێ وەرگرتن و پێمگوتن؛ "ئەم جارە بەتەنها دەڕۆم ئێوە مەیەن." و وەک ئەوەی بچم بۆ دوکانی دیارییەکان بەڕێکەوتم. لە جێی ئەوەی بچم بۆ دوکانی دیارییەکان چوومەوە بۆماڵەوە. دیارییەکانم ژمارد و هەموویم بۆ خۆم دانا. دوای یەک دوو کاتژمێر سەرەتا پەیوەندیم بە فورکان-ەوە کرد. دەمزانی فورکان هەمیشە دەیەوێت یارمەتیم بدات. پێمگوت؛ "کاکە فورکان، لە جێی ئەوەی دیارییەکان ببەم بۆ دوکانی دیارییەکان، بۆ خۆمم هەڵگرتن، من پارەکیتان دەدەمێ، بەڵام دەتوانن کەمێک لەسەرم بوەستن؟" و لێم پرسی دەبێت چەندی پارە بدەمێ. وەڵامەکەی ئەو زۆر دڵخۆشی کردم...

گوتی؛ "کوڕم بۆ قسەت نەکرد؟ چەندت لە تواناداییە ئەوەندە بدە. بەشی برا بچووکیت و هەقی خۆشتی لێ دابشکێنە، تەنانەت

با ۱۰ دانەی دیاری من بێت بۆت بەبۆنەی کارە تازەکەتەوە".
بەڕاستی پیاوێکی پیاوانەبوو! کاتێک سوپاسم دەکرد وشەکان لە قورگمدا گیریانخواردبوو. لەوانەیە چاکەکردنی لەگەڵ من بە ئەرکی خۆی زانیبێت، بەڵام من پێشتر براگەورەیی ئاوام نەبینیبوو بۆیە زۆر هەستی جوڵاندم. ئێستا نۆرەی سێرجان بوو، بەڵام نەمدەتوانی هێندەی فورکان لەگەڵ سێرجان-یشدا ڕاستگۆ بم چونکە شتێکی ناخۆشی دەگوت و کارەکانمی تێکدەدا. بە سێرجانم گوت دیارییەکانم بردووە بۆ دوکانی دیارییەکان بەڵام هیچ پارەی پێ نەبووە بۆیە دوو هەفتەی تر پارەکمان دەداتێ. توڕەبوو و گوتی؛ "شتی وا چۆن دەبێت؟ خێرا پارەکەم بۆ بێنە." بەڵام دەبوو چاوەڕێ بکات کەیفی خۆیەتی. پێمگوت؛ "من پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە کاکە." و تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

ئیتر دەمتوانی بچم بۆ فەرمانگەکەی کاکە موکەڕەم، چونکە ئێستا یەک دنیا بەرهەمی مارکەم لەلایە. پەیوەندیم بە کاکە موکەڕەم-ەوە کرد و گوتم؛ "ئێستا دەتوانم بێم کاکە." و دواتر کۆمەڵێک وێنەی زۆری بەرهەمەکانم گرت و لە پەیجەکەدا بڵاومکردەوە. لەو نێوەندەدا پارەی پسوڵەکانیشمدابوو، ئێستا کارەبا، گازی سرووشتی و ئاو لەماڵەکەماندا هەبوو. پارەم بۆ براکەشم دەنارد و وردە وردە قەرزەکانی خوشکەکەشمم دەدایەوە. هێشتا قەرزی خاوەن ماڵەکەمان لەلا مابوو، بەڵام لە ماوەیەکی کەمدا ئەویشم دەدایەوە و ئێستا لەبەر ئەوەی زۆربەی کات لە ماڵەوەم دایکیشم هەر لە ماڵەوەبوو و نەیدەتوانی بچێت

بۆماڵی دراوسێکەمان و پورم یان با بڵێم؛ نەدەچوو بۆ ماڵ پاککردنەوە. ئێستا بەڕاستی دەچوو بۆ ماڵی دراوسێکەمان و کاتژمێرێک لەوێ دادەنیشت و دەهاتەوە.

هیچ هەواڵێکی باوکمان نەبوو، نەماندەزانی لە کوێیە، چی دەکات، لەڕاستیدا نەشماندەویست بزانین. زۆر توڕەبووم لە باوکم، دوای ئەوەی ڕۆیشت و بەجێیهێشتین یەک جاریش پەیوەندی پێوە نەکردین. ئەوم بە تاوانباری ئەو سەختییانە دەزانی. ڕۆژی دواتر هات، دوو سێ جانتام ئامادەکردبوو، مەحاڵبوو ئەوانە بە پاس ببەم، بۆیە پەیوەندیم بە حوسەین-ی هاوڕێمەوە کرد، ئەو ئۆتۆمبێلی هەبوو و داوام لێ کرد بمگەیەنێت و ئەویش ڕەتی نەکردەوە. هات و بەیەکەوە ڕۆیشتین. کە گەیشتین دڵم زۆر بەپەلە لێی دەدا. کاکە موکەڕەم کەسێکی باش، ڕاستگۆ و متمانەپێکراوبوو. چووم بۆلای، چا و قاوەمان خواردەوە و گفتوگۆمان کرد و گوتی؛ "ئەگەر مۆڵەتم بدەیتێ دەمەوێت ڕای خۆم بڵێم لەبارەتەوە." گوتم؛ "فەرموو کاکە". گوتی؛ "سەیرکە ئاسلان، پێنج شەش ساڵە دەتناسم، منداڵەکانیشم باسی تۆیان بۆ کردووم. دەزانم کە خەڵکیش بە چاوی باشەوە سەیرتان دەکەن، دەزانم چیشت چەشتووە. تۆ کۆڵنەدا و بەردەوامبووی و بەڕای من گەورەتر دەبیت و دەگەیتە شوێنی باش. با ئامۆژگارییەکی برایانەت بکەم؛ خۆت مەدە لە پارەی حەرام، چونکە ئەگەر یەک لیرەی حەرام بچێتە سەر سەد لیرەی حەڵاڵ ئەوا هەر سەد و یەک لیرەکەت حەرام دەبێت. دەزانم تۆ بۆ بەخێوکردنی خێزانەکەت

دەستتدایە ئەم کارە. نازانم باوکت پارەی حەڵاڵی داونەتێ یان نا، بەڵام ئەگەر تۆ نانی حەڵاڵ بۆ خێزانەکەت ببەیتەوە، خودا زیاتر ڕزق و ڕۆزیت بەسەردا دەبارێنێت. زیاترت پێدەدات و خواستی پەیداکردنی زیاتریش دەخاتە دڵتەوە و چاوەڕێ دەکات. چاوەڕێ دەکات تا بزانێت کە تۆ دەتەوێت زیاتر پەیدا بکەیت حەرام تێکەڵی حەڵاڵ دەکەیت یان نا".

سوپاسم کرد و هەرگیز ئەو قسانەیم پشتگوێ نەخست و هەموو وشەکانیم لەسەر مێشکم هەڵکۆڵی. کاتێک بیرم لە قسەکانی کردەوە تێگەیشتم کە بە تەواوی لەسەر هەقبوو. وە کاتی فرۆشتن هات و هەموو فەرمانبەرەکان لە ژوورێکی گەورەدا کۆبوونەوە. بە لایەنی کەمەوە سی چل کەس لە ژوورەکەدابوون و هەمووی خواستی بەرهەمی مارکەیان دەکرد. کاتێک لە فرۆشگاکەدا کارم دەکرد هەر سەرنجی جل و جانتای خەڵکم دەدا، چونکە مرۆڤ بە جل، جانتا و پێڵاوەکانیدا کەسایەتی خۆی دەردەخات. یەک یەک گرنگیم بە هەموویاندا، خزمەتم کردن، بۆم باسکردن کە بۆچی هەرزانە و پێمگوت دیاری دەکڕمەوە و دەیفرۆشم، یەک یەک هەموو شتێکم بۆ هەموویان باسکرد. نزیکەی سێ کاتژمێر لەوێ مامەوە، بەڵام شایەنی ئەوەبوو، چونکە ئەو ڕۆژە شەست و دوو دیاریم فرۆشتبوو. یەکەمجارمبوو هێندە پارەم دەست بکەوێت، هەموویان شتیان لێکڕیم لەبەر ئەوەی مارکە بوون و هەرزانبوون. هەبوو بۆ دایکی، کچەکەی یان براکەی دەکڕی و هەبوو دوو سێ دانەی بۆ خۆی دەکڕی و هەبوو داوای بەرهەمی

تری لێ دەکردم. ئەگەر یەک دوو فەرمانگەی تری وەک ئێرەم دەست بکەوتایە بەرەوپێش نەدەچووم بەڵکو ڕێک دەفڕیم. زۆر بە ئومێدبووم و هەمیشە ئەم ڕستەیە لەسەر زارمبوو: حەددم چییە بڵێم باش نیم؟ لە هەموو دۆخێکدا هەر سوپاس بۆ خودا...

زۆر سوپاسی کەکە موحەڕەم-م کرد و دیارییەکم پێدا و گوتم؛ "با ئەمە دیاری من بێت" بەڵام پەسەندی نەکرد. گوتی؛ "من هەفتەی داهاتوو لێت دەکڕم، هەم بۆ خۆم و هەم بۆ هاوسەرەکەمی دەکڕم، جارێ پێویستمان نییە." و هەستا تا بەڕێم بکات. کە چوومە دەرەوە و سەر ئۆتۆمبێلەکە کەوتم پڕ بە قورگی خۆم هاوارم کرد؛ "ئۆخەی، ئۆخەی.." حوسەین سەری سوڕمابوو و گوتی؛ "کوڕە شێتبوویت؟ ئارامبەرەوە" نەمدەتوانی ئارام ببمەوە هاوڕێ، ئەمڕۆ ڕۆژێکی گەورەبوو. پارەی سێرجان و فورکان-م دەستکەوتبوو و تەنانەت پارەی کرێکەشم بۆ مابووەوە، بەڵام دەبوو دووبارە داوای دیاری لە سێرجان و فورکان بکەمەوە، دەبوو کارەکانم تەواو گەورە بکەم.

پەیوەندیم بە سێرجان-ەوە کرد و گوتم؛ "کابرا نیوەی پارەکەی دەدات، بەڵام داوای دیاری تری کرد و گوتی؛ 'وەرە نیوەی پارەکەی وەربگرە و ئەگەر هی ترت لەلایە خێرا بۆم بهێنە، یەکسەر پارەی ئەوانەت دەدەمێ.'" ئەویش گوتی؛ "سی چل دانەی لێیە" و ئێوارەی بۆمی دەهێنا. ئێستا نۆرەی فورکان بوو. پەیوەندیم بە فورکان-ەوە کرد و گوتم؛ "کاکە دەبێت چەندت پارە بدەمی؟" گوتی؛ "کوڕم چەند دەدەیت بیدە، ئەگەر نەشیدەیت هەر

دەبێت." دووبارە هەوڵی دەدا بۆ منی جێبهێڵێت. نەمدەزانی دەبێت چەندی بدەمێ و دەشبوو هەقی خۆی پێ بدەم. ئێوارە چاوم بەویش دەکەوت و پێمگوت کە دیاریترم دەوێت و ئەویش سێ چل دانەی بۆ دەهێنام. دەبوو خەڵکیتریش بدۆزمەوە تا بەردەوام لێیان بکڕم، ئێوارە باسی ئەم بابەتەم بۆ فورکان دەکرد و داوای یارمەتیم لێ دەکرد.

هاوڕێ لەم نێوەندەدا چل نامەم لە پەیجەکەوە بۆ هاتبوو، سێ نامەشم لە واتسئەپ-ەوە بۆ هاتبوو و دە تەلەفۆنم بۆ کرا، بەڵام نەمتوانیبوو وەڵامیان بدەمەوە. یەک یەک وەڵامی هەموویانم دایەوە و بەردەوامبووم لە کاری پۆستکردنی پەیج لەگەڵ پەیجەکانیتردا. ئیتر هۆشم لەسەر خۆم نەمابوو، مێشکم وەستابوو، دەمویست هەر ئێستا هەموو شتێک بکەم، تەواو بێ ئارامبووبووم. دەنگی خاڵم لە گوێمدا زرنگایەوە کە دەیگوت:

"جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان چاوچنۆکی و تێکۆشاندا. کاتێک چاوچنۆکی دەکەیت بیر لە ئەنجامی هیچ ناکەیتەوە و ناڵێت لەم ڕێگەیەدا کێم پانکردۆتەوە و نا هەقیم بەرامبەر کێ کردووە؟ هەموو شتێک دەکەیت تا بگەیتە کۆتایی ئەو ڕێگەیە، بەڵام تێکۆشان وانییە، بە ئارامگیرییەوە و بە خواستەوە چاوەڕێ دەکەیت، بێ ئەوەی کەس پانبکەیتەوە ئەگەر درەنگیش بێت هەر دەگەیتە کۆتایی ئەو ڕێگەیە".

دەبوو تێبکۆشم نەک چاوچنۆکی بکەم.

ئێوارە سەرەتا چاوم بە سێرجان کەوت، دیارییە تازەکانم لێ وەرگرت و نیوەی پارەی ئەوانەی پێشووم پێدا و گوتم؛ "بەیانی پارەی ئەمانەت بۆ دەهێنم." و لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزیم. زۆر گفتوگۆم لەگەڵ سێرجان نەدەکرد. دوای ئەوەی سێرجان ڕۆیشت فورکان هات. یەک کاتژمێر لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا لەگەڵ فورکان گفتوگۆمان کرد، باسی دۆخەکەم بۆ کرد، ئەویشت دیارییەکانی پێدام و گوتی؛ "کەی ویستت ئەو کاتە پارەکەی بدە. دانەیمان بە پەنجا شەست لیرە دەفرۆشت بە دوکانی دیارییەکە، تۆ چل بدە بە من، با ئەم چاکەیەم هەبێت بۆت".

ئەم پیاوە بەڕاستی پیاوێکی چاکبوو و ئەو دیاریانەی فورکان دەیهێنا مارکەی باشتربوون لەوانەی سێرجان، چونکە سێرجان بە دەستیش دەیفرۆشت و لە ئێمەی دەشاردەوە. کە ڕۆیشتمەوە ماڵەوە دایکم بە پێکەنین و خواردنی گەرمەوە بەخێرهاتنی کردم و هەموو هیلاکییەکەمی ڕەواندەوە... هەموو دەرد و خەمەکانم لەیادچوو. دایکم پێدەکەنی، ئاسوودەیی و خۆشی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو و بووبوون بە میوانی هەمیشەییمان. ئێستا دایکم چیتر نەدەگریا و خەیاڵی نەدەڕۆیشت. سەرەتا متمانەی بە خودابوو پاشان بە من، وە ئەمە شایەنی هەموو ئەو کارکردن و ماندوبوونەم بوو. هەمیشە بە دزییەوە گوێم لە نزاکانی دایکم

دەگرت. ئێستا نزاکانی گۆڕابوون، پێشتر بە گریان و هەنسکەوە نزای دەکرد هەمووشتێک باشببێتەوە، بەڵام ئێستا سوپاسی خودای دەکرد و داوای دەکرد هەموو شتێک باشتر ببێت. ئەمە شتێکە باس ناکرێت و وەسف ناکرێت، دەبێت خۆت بەسەرتدابێت ئینجا لێم تێدەگەیت دۆستم...

هەرگیز مەڵێ دۆڕام.
دوای دۆڕان ئینجا دەتوانیت فێری بردنەوە ببیت.
هەرگیز خۆت مەدزەرەوە لە شەڕ.
بزانە هەمیشە چاکە لە خراپە دەباتەوە.



## لە ڕۆژە سەختەکاندا فێری ئارامگری دەبیت
## هەنگاو دەنێیت بەرەو چاکە
## هیچ سەختییەک ناتوانێت لێت بباتەوە
## دڵنیابە لەمە دۆستم...

ئێستا ژیانێکی دیکەشم هەبوو جگە لە کار؛ خۆشەویستێکم هەبوو. تەنها دەمتوانی بە نامە و تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بکەم بۆیە ناڕازی بوو. دەبوو ئیتر زیاتر کاتی بۆ تەرخان بکەم و چاوم پێی بکەوێت، هەم کات بۆ ئەو تەرخان بکەم هەم بۆ خۆم. دەمویست کەمێک پشوو بدەم و ئاسوودە ببم. دەستمانکرد بە یەکبینین، و ڕۆژانە یەک دوو کاتژمێر بەیەکەوە کاتمان بەسەردەبرد و کاتەکانم بە کار و گرنگیدان بە خۆشەویستەکەمەوە بەسەردەبرد، بەلام کە کاتم لەگەڵ ئەویش بەسەردەبرد ئازارم دەچەشت چونکە هێشتا خۆشەویستی ئامادەییم لەیادنەکردبوو سەرەڕای ئەوەی دوای ئەو دنیایەک کەسم ناسیبوو و خۆشەویستی ترم هەبوو. هیچ لە خەیاڵم دەرنەدەچوو. ئایا ئەمە ناهەقیبوو بەرامبەر ئەو کەسانەی دێنە ژیانمەوە؟ بەڵێ، ناهەقی بوو، بەلام هیچم لەدەست نەدەهات. دەبوو ڕێگایەک بدۆزمەوە تا لەبیری بکەم، بەلام نەمدەتوانی لەبیری بکەم. هەموو ڕێگەیەکم تاقیکردەوە،

بەڵام هەر نەمتوانی لەبیری بکەم. ئەو کاتەنەش کە وامدەزانی لەبیرمکردووە لە ناکاو دەهاتەوە خەیاڵم و دنیام دەوەستا... بە کورتی هەرچییەکم کرد نەمتوانی لە یادی بکەم.

لەو ڕۆژانەدا درکم بەوە کرد کە لەماوەی یەک دوو مانگدا لە ساڵی ڕابردوو زیاتر پارەم پەیداکردبوو. هەرچەندە ئەو پارانەم دابووەوە بە بەرهەمیتر و پارەی پسوڵەکانم لێدابوو، بەڵام هەر پەیدامکردبوو، و پەیجێکم هەبوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبوو. پێشتر پێمگوتبوون ژمارەی فۆڵۆوەرەکانم گەیشتبووە بیست هەزار کەس وانیە؟ ئێستا گەیشتبووە سی هەزار کەس، سی هەزاااار! ناتوانم بەباشی باسی ئەو ساتانەتان بۆ بکەم، چونکە باش بیرم نایەت، هەموو شتێک زۆر خێرابوو، زۆر خێرا ژیانم گۆڕا. هەنگاوم نەنابووە ژیانی دووەمەوە ڕێک فرێبوومە ناوی و بەینم زۆر باشبوو لەگەڵ پەیجەکانی تری فرۆشتنی ئەو پلاتفۆرمە و خەڵکەکەدا، هەموو کەسێک دەیتوانی باسی هەموو شتێک بۆ یەکتر بکات.

لەو ژینگە ئەلکترۆنییەدا هاوڕێم پەیداکردبوو، دۆستم هەبوو و قسەم دەڕۆیشت، چونکە من لە هەموو کەسێک باشتر کاری ڕیکلام و بڵاوکردنەوەی پەیجەکانم دەکرد، هەرچەندە خۆشم لە خەڵکیترەوە فێربووبووم. من بڕیارم لەسەر بابەتەکان دەدا و جۆری جیاوازی ڕیکلامم درووست دەکرد. هەرچەندە خەڵکی زۆر خۆشیان دەویستم، زۆر کەسیش ڕقیان لێمبوو، زۆر کەس کەیفی پێم نەدەهات، چونکە زۆر پەیج منیان بلۆک کردبوو. هەرگیز

لێم نەپرسین بۆچی، کاتم نەبوو بۆ ئەمە. دەبوو بەردەوامبم لە بەرەوپیشچوون بێ ئەوەی سەیربکەم بزانم کێ لەگەڵمە و کێ لەگەڵم نییە. دەمگوت؛ "خودام لەگەڵە" و بەرەو داهاتووم رامدەکرد...

ئەو ماوەیە نە عاشق و نە دەرد و خەم، هیچ لە مێشکمدا نەبوو، تەنها ئیش و ئیش و ئیش لە مێشکمدابوو... لە ژیانمدا بۆ یەکەمجار هەلێک هاتبووە بەردەمم و نەمدەتوانی ئەم هەلە لەدەست بدەم و دەبوو بەکاریبهێنم. ئیتر کارێکم هەبوو کە رۆژ بە رۆژ گەورەتر دەبوو...

فورکان پەیوەندی دەکرد و بەرهەمی بۆ دەهێنام، سێرجان پەیوەندی دەکرد و بەرهەمی بۆ دەهێنام... ئێستا بە نەقد پارەی هەموویانم دەدا. خاوەن دوکانی دیارییەکانیش پەیوەندی پێوە دەکردم و داوای بەرهەمی دەکرد، بەڵام نەمدەتوانی بۆی ببەم، چونکە بەشی نەدەکرد. تاکە سەرچاوەی ئەویشت من بووم بۆیە ویژدانم نائارامبوو و جارجار کەمێک دیاریم بۆ دەبرد. باسی دۆخەکەم بۆ ئەویش کرد و گوتم؛ "ئێستا خۆم دەیانفرۆشمەوە، مادەم بەم ئیشەوە ناوم دەرکرد با پارەکەشی بخۆم"، ئەویش خودا لێی رازیبێت براگەورەیی خۆی نواند و رێ و شوێنی فێرکردم. لەبەر ئەوەی تازە دەستم بەم کارە کردبوو کەموکورتی زۆرم هەبوو و ئەم کارە لە کاری فرۆشگاکە نەدەچوو، زۆر قورسبوو لە رێی ئینتەرنێتەوە متمانەی خەڵک بەدەستبهێنم. نەمدەتوانی رووبەروو قسە لەگەڵ کڕیارەکاندا بکەم و خزمەتیان

بکەم و دەبوو تەنها لەڕێی ئینتەرنێتەوە ڕازیان بکەم و ئەمەش زۆر قورسبوو.

نەمدەتوانی ڕوخسار و هەڵسوکەوتەکانی بەرامبەرەکەم ببینم و بزانم کام قسەیەی بەدڵە و کامەی بە دڵ نییە. بە کورتییەکەی کارێکی زۆر قورس بوو، بەڵام وردە وردە فێری هەموو شتێکبووم. دەمزانی کە کەموکورتی زۆرم هەیە. لە هەمووشی گرنگتر کاتێک لە ڕێی ئینتەرنێتەوە شتم دەفرۆشت هەنێک لە کڕیارەکان نەیاندەویست پارەی گەیاندن بدەن، یان ئەوەشیان وەک قازانجی من دەبینی. هەمیشە قسەیان پێدەگوتم لەسەر نرخی گەیاندنەکان، دەبوو کێشەی گەیاندن چارەسەر بکەم، بەڵام دەبوو کۆمپانیام هەبێت تا ڕێککەوتن بکەم لەگەڵ کۆمپانیای گواستنەوەدا، کۆمپانیاش پێویستی بە ئۆفیسبوو، ئۆفیسیش پێویستی بە پارەبوو، کۆمپانیاش هەر پارەی دەویست. دەبوو بە شێوەیەکی تر ئەم کێشەیە چارەسەر بکەم.

دوای ئەوەی لە دوکانی دیارییەکان هاتمە دەرەوە چووم بۆ نوسینگەی کۆمپانیایەکی گەیاندن. پرسیاری کارەکان و ڕێوشوێنەکانم لێکردن و وەڵامیاندامەوە. هیچیان بۆ من گونجاو نەبوون، نەمدەتوانی هەموو سەرمایەکەم واتە ئەو پارەیەی لە فرۆشتنی بەرهەمە تازەکانەوە دەستم دەکەوێت، خەرجبکەم بۆ دروستکردنی کۆمپانیا، توانای ئەوەم نەبوو. دەبوو بە لایەنی کەمەوە یەک دوو مانگ چاوەڕێ بکەم تا پارەی پێویست کۆبکەمەوە، بەڵام کڕیارەکان ناڕازیبوون لە کرێی گەیاندن و

دەبوو چارەسەرێک بۆ ئەم کێشەیە بدۆزمەوە.

کورێک هەبوو ناوی سەرهان بوو و لە کۆمپانیای گەیاندن کاری دەکرد و زوو زوو دەهات بۆ دووکانی گەڕەکەکەمان، پەیوەندیم بەو کوڕەوە کرد و باسی کێشەکەمم بۆ کرد. لێم تێگەیشت و گوتی: "من ئەمەت بۆ چارەسەر دەکەم، خەمت نەبێ، کەی ویستت شت بنێریت پەیوەندیم پێوە بکە، لێرە یەک دەبینین و و لێت وەردەگرم و بە نیوەی نرخەکەی بۆت دەگەیەنم". کە وای گوت هەموو دنیا بوو بە هی من. زۆر سوپاس بۆ خودا هەموو شتێک بە باشی دەڕۆیشت، دەمزانی خودا لەگەڵمە، هەستم پێیدەکرد و باوەڕمپێیبوو...

ڕۆژانــە پێنج بۆ دە بەرهەمم دەفرۆشت و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی فۆڵۆوەرەکانم زیادیان دەکرد. لەو ماوە کەمەدا هەموو کرێ کۆبوەوەکانم دایــەوە. تەنها قەرزەکانی خوشکەکەم و پارەی براکەمم لەسەربوو، وردە وردە ئەوانیشم چارەسەر دەکرد. هەموو جارێک کە دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە بەپەلە دەچووم بۆ ژوورەکەم و یەک یەک بەرهەمەکانم دەژمارد. ئەو ڕۆژانەی هیچیشم نەفرۆشتبوو هەر دەمژماردەوە، پاکم دەکردنەوە و یەک یەک وەک منداڵی خۆم گرنگیم پێدەدان. ڕۆژانێکی خۆشبوون، ڕۆژانــی پڕ خۆشی، ترس و ئومێدبوون. بەرهەمەکانم وەک ئاڵتون دەبینی هــەر یەکەیان پارچەیەک ئاڵتونبوون بۆ من. بێگومان خەڵکیتریش کارەکەمیان وەک ئاڵتون دەبینی. ئێستا لە چاوی هەموو کەسێکدا ئاسلان-ێکبووم کە لە ماوەیەکی کەمدا

کاری خۆمم درووستکردبوو، خێزانەکەمم هەڵساندبوەوە و هەموو قەرزەکانمم دابوەوە. بێگومان ئیرەیی و چاوپیسی شتێتی خراپن. من کاتێک لەوە تێگەیشتم کە لێکۆڵەری دارایی چووبوون بۆ کۆمپانیای گەیاندنەکە و پرسیاری منیان کردبوو...

بێزارنەبووی لەوەی چاوەڕێی یارمەتی
لە دۆستەکانت بکەیت؟
هیلاک نەبوویت لەوەی خۆت خەمبار بکەیت؟
هەر بەڕاستی بێزارنەبوویت
لەوەی متمانە بە خۆت نەکەیت
بەهۆی پرسیارەکانی؛
"کێ لەگەڵم دەبێت؟"
"کێ لە پشتم دەبێت؟"



**سەیری چواردەورت مەکە تا بزانیت کێت لەلایە.**
**بڵێ؛ "خودا بۆ من بەسە"،**
**و بەردەوامبە لەسەر ڕێگەکەت...**

ڕووداوەکـە بەم شێوەیە ڕوویـدابـوو: کەسێک پەیوەندی بە لێکۆڵەرانی داراییەوە کردبوو، پێی گوتبوون؛ "کەسێک لەڕێی ئیتەرنێتەوە شـت دەفرۆشـێت و بـاج نـادات." و شکاتی لێ کردبووم. لێکۆڵەرەکانیش بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەمە چووبوون بۆ کۆمپانیای گەیاندنەکان و پرسیاری منیان کردبوو، تەنانەت پرسیاری ناوی دایکم، خوشکەکەم، باوکم و برا سەربازەکەشمیان کـردبـوو. ناومیان لە کۆمپانیای گەیاندنی هاوڕێکەم بینیبوو و چووبوون بۆ ئەوێ. بەپێی تۆمارەکان ئەو ڕۆژە تەنها یەک شتم ناردبوو و لەم مانگەی دواییدا تەنها ٩ جار شتم ناردووە. لەڕاستیدا خۆی زیاتربوو، بـەڵام زۆر جار هاوڕێکەم بەناوی خۆیەوە دەینارد تا داشکاندنی ٥٠٪ بیگرێتەوە، بۆیە نەهاتبوون بۆ ماڵمان. قسەیان لەگەڵ کارمەندانی کۆمپانیای گەیاندنەکە کردبوو و گوتبوویان "شتێکی گرنگ نییە" و ڕۆیشتبوون.

هاوڕێکەم پەیوەندی پێوەکردم و بۆی باسکردم. گوتی؛ "ئیتر ناتوانیت لە ماڵەوە شت بفرۆشیت، ئەمە کێشەت بۆ دروست دەکات". ئەگەر ژیان بینایەکی پەنجا قاتی بوایە من جارێ لەسەر

قادرمەی یەکەم قاتبووم. بۆچی کە قاچ دەخەمە سەر هەر پلەیەک ئەم بینایە بەسەرمدا دەڕوخێت؟ ئەم لەشە بچووکەم چۆن ئەم هەموو بارەی پێ هەڵدەگیرێت؟ بەڵام سوپاس بۆ خودا هەموو جارێک دەمگوت؛ "خوا خۆی دەزانێت چی دەکات" و لە ژێر ئەو وێرانەیەدا هەڵدەستامەوە سەرپێ، جارێ نەمردبووم، نەچوبوومە ناو گۆڕەوە و لە ژێر گڵدا نەبووم با لە ژێر چەندین قاتیشدابم... دەمزانی ئەگەر من بکەوم خێزانەکەشم دەکەوێت. بۆیە دەبوو چارەسەرێکیتر بدۆزمەوە. دەبوو کۆمپانیایەک دابنێم و ئۆفیسێک بکەمەوە. دەمتوانی بە شێوەی (هۆم ئۆفیس) کار بکەم، بەڵام ئەو کاتە نەمدەتوانی وەسڵ ببڕم. دەبوو فرۆشگایەک بکەمەوە، بەرهەمی وەسڵدار بکڕم و بۆ ئەمەش پێویستم بە پارەی زۆربوو، منیش ئەو هەموو پارەیەم پێنەبوو. بە لایەنی کەمەوە یەک ساڵم دەویست بۆ کۆکردنەوەی ئەو پارەیە، بە لایەنی کەمەوە...

دیسان گیرمخواردبوو، بەڵام نەدەبوو کۆڵبدەم. دەبوو هەستمەوە سەرپێ، هیچ چارەیەکیترم نەبوو دۆستم... مێشکم وەستابوو، هەر بیرمنایەت ئەو ڕۆژە بیرم لە چی کردەوە. چووبوومە ژوورەکەی خۆم، ئەمڕۆ ئەو بەرهەمانەم نەژمارد کە هەموو ڕۆژێک یەک یەک دەمژمارد. نزیکەی شەست نامەم بۆ هاتبوو، وەڵامی یەک دانەشم نەدایەوە. وەڵامی پەیوەندییەکانیشم نەدەدایەوە. وەستابووم، چاوەڕێی شتێکم دەکرد، بەڵام نازانم چیبوو...

دەمویست تەنها بەدەم چا و قاوە و جگەرەوە ئەو ڕۆژە تێبپەڕێنم و بچمە ڕۆژی دواترەوە. بەیانی هەستام لە خەو، دەست و دەموچاوم شت و بە دایکمم گوت کە نانی بەیانی ناخۆم و یەکسەر پەیوەندیم بە حوسەین-ی هاوڕێمەوە کرد. پێمگوت؛ "خێرا ئۆتۆمبێلەکەت بهێنە و وەرە". هەموو بەرهەمەکانم ژمارد و کۆمکردنەوە، کردمنە ناو جانتا و زەرفەوە و ڕێک بەرەو دوکانی دیارییەکان ڕۆیشتین. بە دنیایەک زەرف وجانتاوە خۆمان کرد بە دوکانی دیارییەکاندا، خاوەنی دوکانی دیارییەکان چاوی زەقبووبووەوە. خاوەنی دوکانەکە ناوی کاکە فواد بوو. نازانم پێشتر گوتومە یان نا، بەڵام کاکە فواد بەڕاستی پیاو بوو...

گوتی؛ "ئۆۆۆوو، ئاسلان، بەخێربێیت! گەنجینەت بۆ هێناوم؟ کوڕە ئەوە چەند دانەن؟ خۆ من ناتوانم هەمووی بکڕم". نزیکەی دوو مانگبوو کاکە فواد داوای دیاری لێ دەکردم، بەڵام نەمدەتوانی بۆی ببەم، چونکە خۆم دەمفرۆشتن. دەمزانی کە لە ئینتەرنێتەوە چاودێری کارەکانم دەکات و دەزانێت باش دەڕوات...

دانیشتم و گوتم؛ "کاکە فواد با کەمێک قسەبکەین و گوێم لێبگرە، دواتر بەپێی ئەوە کار دەکەین. ئەم بەرهەمانەم هێناوە تا بەتۆی بفرۆشم، بەڵام دانیشە با بۆت باسبکەم بۆ هێناومە." و هەموو جانتا و زەرفەکانم کردەوە تا بیبینێت. نزیکەی دووسەد دانەبوون، واتە بایی دە هەزار لیرە کەلوپەل لەسەر ئەو مێزەبوو. بە حوسەین-م گوت؛ "کەمێک مۆڵەتمان دەدەیت؟" و داوام لێ کرد بچێتە دەرەوە. باسی هەموو شتێکم بۆ کاکە حوسەین

کرد. ڕاستگۆیانە پێمگوت کە شکاتم لێکراوە و چیتر ناتوانم لە ماڵەوە شت بفرۆشم، بۆیە هاتووم تا ببمە هاوبەشی. گوتم: "تۆ پێویستت بە بەرهەمە تا بیفرۆشیت و جگە لە من کەس هیچت بۆ ناهێنێت." و سەیرێکی ڕەفەکانیم کرد، نزیکەی پەنجا بەرهەمێکی تێدابوو. لەسەر هەقبووم، ئەویش ئەمەی دەزانی، بەڵام لەبەر ئەوەی براکەی ناپاکییەکی گەورەی لێکردبوو بە ترسەوە سەیری هاوبەشیی دەکرد، بەڵام من سوودی زیاترم بۆی دەبوو، چونکە هەم بەرهەمەکانم دابین دەکرد هەم زۆر باش دەمفرۆشتن، بەڵام من دوکانم نەبوو و چیتر نەمدەتوانی زاڵبم بەسەر کارەکەمدا و نە پارە و نە سەرمایە و نە کۆمپانیایەکم نەبوو تا زیاتر بەرەپێشم ببات. دەمزانی داهاتی مانگانەی کاکە فواد حەوت هەشت هەزار لیرەیە. من دەمتوانی ئەمە بکەم بە دوو قات. هەم کڕیارەکانم بانگهێشت دەکرد بۆ دووکانەکە هەم ئەم دووکانە دەبووە هۆی زیادبوونی متمانەی کڕیارەکان...

کاکە فواد سەری لە قسەکانم سوڕمابوو و بە ساردی سەیری دەکردم، چونکە لە کاتێکدا کە دەبوو پارەی پێبدەم تا ببمە هاوبەشی، من داوای پارەم لێدەکرد. نرخی هەموو بۆنەکانم پێگوتبوو، داوام لێکردبوو پێم بداتەوە. بەڕاستی زۆر سەریسوڕمابوو. چەندین ساڵبوو کاسپی دەکرد و شتی وای نەبینیبوو، بۆیە گوتی: "کوڕم تۆ دەتەوێت ببیتە هاوبەشی من، بەڵام داوای پارەم لێدەکەیت بۆ ئەمە. بەڕای تۆش شتێکی بێ مانا نییە؟" منیش دانیشتم دووبارە بۆم باسکردەوە، گوتم: "من دووسەد بۆنم هێناوە بۆ

ئێرە. پارەی هێنانیانم پێدەدەیتەوە و کە فرۆشتمانن تۆ ئەو پارەیە هەڵدەگریتەوە و قازانجەکەی دەکەین بە دوو بەشەوە. داهاتت لە حەوت هەشت هەزار لیرەدا گیرناخوات و دڵنیات دەکەمەوە کە مانگانە نزیکەی پانزە هەزار لیرە قازانج دەکەین". گوتی؛ "یەک ڕۆژ مۆڵەتم بدەرێ". دەبوو بەرهەمەکان لەوێ بەجێبهێڵم بۆیە داوام لێکرد تا ڕۆژێک لەوێ بمێننەوە و گوتم؛ "ئەگەر ڕازی نەبوویت دێمەوە و هەموویان دەبەمەوە کاکە."

بەڵام دڵنیابووم ڕازی دەبێت. ئەویش هاوشێوەی من گیریخواردبوو. من بەهۆی لێکۆڵەرەکانەوە و ئەویش بەهۆی نەبوونی بەرهەمەوە گیریخواردبوو. ئەمە چارەسەرێکی باشبوو بۆ هەردووکمان و هێزەکانمان یەکدەخست، بەڵام کاکە فواد زۆر زەرەی کردبوو بەهۆی ئەو هاوبەشییەوەی لەگەڵ براکەیدا کردبووی. تەنانەت هەموو خێزانەکەشی زیانیان پێ گەیشتبوو. نەمدەزانی کە هەموو کاسپکارەکانی دەورووبەریشی ئاگاداری ئەم ڕووداوەن، دواتر پێیانگوتم. بۆیە نە خێزانەکەی و نە کاسپکارەکانی دەورووبەری پێیان نەگوتبوو؛ "باشە ببە بە هاوبەشی". ڕاوێژی بە هەر کەسێک کردبێت شتی نەرێنی گوتبوو. منیان نەدەناسی، بەڵام کە لە دوورەوە سەیرت دەکردم لە کەسێکی زۆر باش نەدەچووم.

کە چوومە دەرەو حوسەین پرسی؛ "تۆ چیت کرد کوڕە، هیچ تێنەگەیشتم". گوتم؛ "بووم بە هاوبەشی" و باسی دۆخەکەم بۆ کرد. حوسەین-یش ڕێک ئاوای گوت:

"ئەم پیاوە دەبێت بە هاوبەشت و پارەشت دەداتێ، ها؟" کە گوتم؛ "بەڵێ براکەم" گوتی؛ "دەتداتێ دەتداتێ!" منیش پێکەنیم و گوتم؛ "بەیانی دەیبینیت." بەڵام نازانم ئەم هەموو متمانەیەم بە چی خۆم بوو. وەک ئەوەی دڵم خەبەریدابێت. ڕۆژی دواتر کاکە فواد پەیوەندی پێوە کردم و چووم بۆلای. ئەو پارەیەی داوامکردبوو ئامادەبوو و لەسەر مێزەکە دانابوو و هەموو بەرهەمەکانی خستبووە ناو ڕەفەکانەوە. پارەکەم هەڵگرت و بەدەم ژماردنییەوە گوتم؛ "بێ ئومێدت ناکەم کاکە، خەمت نەبێت." و پێکەنیم. بەڵام ئەو دەموچاوی بەیەکدا دابوو و گوتی؛ "تەنها یەک تکام لێت هەیە." و بەم شێوەیە بەردەوامبوو لە قسەکانی:

"من تەمەنم پەنجا ساڵە. هەتا ئێستا زیانم بۆ کەس نەبووە، بە تایبەتی هەمیشە خۆم لە بازرگانی و پارە بەدوور گرتووە، چونکە دەزانم ئەوەی دەینێرێت و دەشیباتەوە هەر خودایە. من باوکایەتیت بۆ دەکەم بەڵام تۆ ئەوە مەکە کە براکەم برامبەرم کردی، تۆش کوڕێتیم بۆ بکە." کە وایگوت تێنەگەیشتم مەبەستی چییە بۆیە لێم پرسی؛ "خێرە کاکە، ئادەی باسیکە. برایەتی لای ئێمە شتێکی باشە، چەند خۆش دەبێت ئەگەر ببمە برات". نەمدەزانی براکەی چی پێ کردووە...

ئەو پیاوە بە دەستنوێژ و نوێژکەرە دڵ باشە بەهۆی براکەیەوە کەوتبووە زیندانیشەوە. بەهۆی چەکێکی بانقییەوە کە پارەکەی نەداوە دە دانە دوکانی فرۆشتووە و خواردوێتی. کەسێکی کەمێک نابەرپرس بووە، ئەمانەی بەسەردا هێناوە و بووەتە هۆی

ئیفلاسکردنی، بەڵام هێشتا نەمبینیەوە یەک جار قسەیەکی ناخۆش بە براکەی بڵێت. گوتم؛ "تۆ باوکایەتیم بۆ بکە و منیش کوڕێتیت بۆ دەکەم بەڵێن بێت". و بەم شێوەیە بەردەوامبوو؛ "سەیرکە ئاسلان، ئەگەر پابەندبیت بەم یاسایەوە لە هاوبەشیدا ئەوا خودا لەگەڵمان دەبێت" و حەدیسێکی شەریفی بۆ خوێندمەوە و گوتی؛ "خودای گەورە فەرمویەتی: ئەگەر دوو هاوبەش ناپاکی لەیەک نەکەن ئەوا من دەبمە هاوبەشی سێیەمیان. ئەگەر یەکێکیان ناپاکی لە هاوڕێکەی بکات ئەوا من لە نێوانیاندا نامێنم." کە وای گوت ئەو قسەیە لە مێشکمدا چەسپا و بەڵێنم پێدا و گوتم؛ "خەمت نەبێت".

لەو تێدەگەیشتم، دیاربوو ترسی هەیە، بەڵام کەسێکبوو دەیتوانی لەسەر پێی خۆی بوەستێت و زۆر بەدوای ماڵ و موڵکدا ڕاینەدەکرد و باری ماددیشی باشبوو. من پارەی خۆمم وەرگرت و بۆ ڕۆژی دوایی لەویّ دەستم بە کار دەکرد. هەموو ڕۆژێک بەیانی دەهاتم بۆ سەر کار و ئێواران دەڕۆیشتمەوە. دوکانەکە و ماڵەوە زۆر دووربوون لەیەک و پێویستم بە ئۆتۆمبێلبوو تا بچم بۆ فەرمانگەکانیش. هەر ئەمە هۆکاری سەرەکی پارە وەرگرتنم بوو لەم، دەمویست ئۆتۆمبێلێک بکڕم. هەم بە ئۆتۆمبێلی خۆم دەچووم بۆ سەر کار و هەم فەرمانگە بە فەرمانگە دەگەڕام و شتم دەفرۆشت. تەنانەت ڕۆژێک پێش ئەوەی بچم بۆلای ژمارەی تەلەفۆنی برای هاوڕێیەکم وەرگرت کە پێشانگای ئۆتۆمبێلی هەبوو. پەیوەندیم بەوەوە کرد، پارەکەم هەڵگرت و بەرەو لای ئەو بەڕێکەوتم. ڕۆیشتم، ئۆتۆمبێلێکم هەڵبژارد کە

پارەکەم بەشی دەکرد و هەموو پارەکەم دا بەو ئۆتۆمبێلە. لە یەک ڕۆژدا ئۆتۆمبێلیشم کڕی و بەیانی دەچووم بۆلای دادنووس و مامەڵەکانیم تەواو دەکرد.

ڕۆژی دواتر لەلای دادنووس هاتمەوە و یەکسەر چوومەوە بۆ ماڵەوە. بە کورتی ڕووداوەکانت بۆ باس دەکەم تا بتوانیت بیهێنیتە پێش چاوی خۆت، دۆستم...

کە گەیشتمەوە ماڵەوە بینیم دایکم دیسان خەمبارە، لە چێشتخانەکە دانیشتبوو بیری دەکردەوە؛ "ئەم کوڕە چی کردووە؟" دانیشتم و بۆم ڕوونکردەوە بێ ئەوەی باسی شتە ناخۆشەکان و لێکۆڵەرەکان بکەم، پێمگوت کە بووم بە هاوبەشی دووکانێک و ئێستا دوکانی خۆمان هەیە. پێمگوت ئیتر زیاتر کاردەکەم و دەچم بۆ سەر کار، تەنانەت بە درۆوە پێمگوت کاکە فواد ئۆتۆمبێلی بۆ کڕیوم و وردە وردە لە مووچەکەمی دەبڕێت. هەرچەندە هەموو شتێکم بە تەواوەتی بۆ باسنەکرد، بەڵام بەجۆرێک باسمکرد کە ئەقڵی بیگرێت و توانیم دایکم بخەمەوە پێکەنین. پێکەنینی دایکم لە هەموو شتێک گرنگتربوو بۆم.

چونکە دەمزانی...

ئەگەر دایکت نەمێنێت، کەس نامێنێت بەڕاستی بۆت بگری.
هەناسە، تەمەن، پشت و پەنات نامێنێت.
لەم خانە دوو دەرگایەدا،
جێگەت نامێنێت.
ئەگەر دایکت نەمێنێت،
ئەو دەستە نامێنێت کە لە کاتی تەنگانەدا فریات دەکەوێت.
ئەقڵت نامێنێت، گیانت نامێنێت.
منداڵەکەی ناو ئەو دڵە داخکراوەت نامێنێت.
ئەگەر دایکت نەمێنێت،
دەستێکت نامێنێت ماچی بکەیت.
جەژنت نامێنێت."

یەک نزای دایکم گەورەترین گەنجینەی دونیابوو بۆ من. باوکیشم لایە شکاوەکەمبوو، هۆکاری بەهێزیمبوو. ڕۆژی دواتر بە خۆشییەکی زۆرەوە هەستام لە خەو، دەبـووم بە خاوەنی ئۆتۆمبێل، هـەر بە دەم خۆشە. ئـەم ئۆتۆمبێلە یەکێکبوو لەو ئۆتۆمبێلانەی کە لەسەر شۆستەکان دادەنیشتم و سەیری خەڵکم دەکـرد و لەبەر خۆمەوە دەمگوت؛ "ئـەم خەڵکە چۆن دەتوانن ئەم ئۆتۆمبێلانە بکڕن؟" ئۆتۆمبێلێکی مامناوەندبوو، بەڵام لەلای من هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ پۆرش-دا. ئۆتۆمبێلی خۆت جوانترین ئۆتۆمبێلە لەلات، ئەمە لەبیرنەکەیت دۆستم. تۆ پێویستت بە کامە بێت و کامەیان بۆ تۆ گونجاوبێت ئەوە پۆرش-ی تۆیە.

بەو خۆشییەوە هەتا نیوەڕۆ هەموو مامەڵەکانی ئۆتۆمبێلەکەم تەواوکرد و سەر ئۆتۆمبێلەکەم کەوتم و چووم بۆ دوکانەکە. کە گەیشتمە ئەوێ یەک یەک داواکارییەکانم لە پاکەتنا و ئامادەم کردن. کاکە فواد دەیویست باسی کارەکەم بۆ بکات، بەڵام بە وریاییەوە دەجوڵایەوە. یەکەم ڕۆژی کارم دە بەرهەمم فرۆشت و زۆر دڵخۆشبووم. دوای ئەوەی بەرهەمەکانم لە پاکەتنا پرسیاری گەیاندنم لە کاکە فـواد کـرد، ئـەو لـەگـەڵ هیچ کۆمپانیایەکدا ڕێکنەکەوتبوو، بەڵام لەبەر ئـەوەی کۆمپانیای خۆی هەبوو بە ئاسانی دەیتوانی ڕێککەوتن ئەنجام بدات. بەپەلە پەیوەندیم بە هاوڕێکەمەوە کرد کە لە کۆمپانیای گەیاندن کار دەکات و ئەویش ژمارەی کارمەندێکی لقەکەی نزیک دوکانی ئێمەی پێدام. لە ماوەی نیو کاتژمێر بۆ سێ چارەکدا کێشەی گەیاندنیشم چارەسەرکرد.

کاکە فواد زۆر سەریسوڕمابوو و بەڕاستی تێنەدەگەیشت چی دەکەم، چونکە دوو وەچەی زۆر جیاوازبووین. کاسپی ئەو لە ناو دوکاندابوو، بەڵام ئەوەی من لە ڕێگەی ئینتەرنێت و تەکنەلۆجیاوەبوو و ئێستا هەموو شتێک لە ئینتەرنێتدایە. بۆم باسکردبوویت کە خۆشەویستێکم هەبوو؛ چیتر چاوم بەو نەدەکەوت. لە هەموو چاوپێکەوتنێکماندا من حسابەکەم دەدا و پارەم خەرج دەکرد بۆیە وازم لێ هێنا. هێشتا هەر عاشقی ناوەندیم لەیاد نەکردبوو، بۆیە نەمدەویست چاوم بە هیچ کچێک بکەوێت ئەگەر هەر هاوڕێی ئاساییشمبوایە، هەموو بیر و هۆشم هەر لەلای عاشقی ئامادەییمبوو. ئەگەر ئەوەش نەبوایە، هەر نەمدەتوانی هێندە پارە خەرجبکەم لە دەرەوە. دەبوو خێزانەکەم بەخێو بکەم و بیر لەوان بکەمەوە. نەدەکرا کاتێک لە ماڵەوە نان و پیاز دەخۆین لە دەرەوە گۆشت بخۆم، یان کاتێک من لە دەرەوە نانم دەخوارد دایکم چی بخواردایە؟ براکەم لە سەربازی چی بخواردایە؟ هەمیشە بیرم لەمانە دەکردەوە. ئاە عاشقی ناوەندیم، ئاە خۆشەویستە جوانەکەم، ئاە ئەو کەسەی بەهەشت خۆی لە پێکەنینە جوانەکەیدا شاردبوەوە، ئاە... زۆر ناخۆش جیابووبوومەوە لێی، بۆیە هەر نەمانتوانی ئاشتببینەوە. پێنج شەش ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو، بەڵام هێشتا بیر و هۆشم هەر لەلای ئەو بوو. لە کاتی جیابوونەوەماندا دڵم بەجۆرێک شکابوو کە هێشتا لەوێدا مابوەوە، یادەوەرییەکانم لەوێدا بەجێمابوون و من لەوێدا خۆمم سوتان، لەبەر عەشق بووم بە خۆڵەمێش و لە

ناو ئەو عەشقەدا نێژرام تا هەرگیز نەیەمەوە دەرەوە.

ئێستا دەڵێیت؛ "ئاسڵان لەو بەینەدا جێی عەشقیشی کردەوە" بەڵێ چونکە دڵنیابە عەشق قوڵترین برینمە...

بەهەرحاڵ بابێینەوە سەر بابەتەکەمان... لە ئینتەرنێتدا بەردەوامبووم لە گەورەبوون، هەموو شتێکم دەکرد تا شتی زیاتر بفرۆشم. کاتێک من هاتم داهاتی مانگانەی کاکە فواد حەوت هەشت هەزار لیرەبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەی هێشتا پانزە ڕۆژبوو من هاتبووم، حەوت هەزار لیرەمان پەیدا کردبوو. نازانم چۆن باسی ئەو خۆشییەی سەر ڕوخساری کاکە فواد-تان بۆ بکەم. بەڵام دەبوو کاری زیاتر بکەم، خۆ ئۆتۆمبێلەکەم بە خۆڕایی نەکڕیبوو، وانیە؟ تەنها بۆ هاتن و چوون بۆ سەر کار نەبوو...

پەیوەندیم بە فەرمانگەکانەوە کرد و دەستم کرد بە سەردانکردنیان. ڕۆژی پانزەیەم تا گەڕامەوە بۆ دوکان کاڵایەکی زۆرم فرۆشتبوو. دەمێکبوو گومانەکانی کاکە فواد نەمابوون و منیش ئیتر نەدەترسام. تاکە شت کە دەبوو بیکەم کارکردنی زیاتربوو. هیچ ڕێگەچارەیەکیتریشم نەبوو. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کارەکانم زیاتر بەرەوپێشبرد. هیچ شتێکم بۆ خۆم نەدەکرد بەو پارانەی پەیدام دەکرد، هەر بەردەوامبووین لە شت کڕین بۆ دوکانەکە. داهاتی مانگانەی دوکانەکەمان گەیاندە بیست هەزار لیرە. دوای دوو مانگ ئەو بیست هەزار لیرەیەشمان بە دڵنەبوو و نزیکەی پێنج سەد دانە بەرهەم لە دوکانەکەماندا هەبوو، هەر خەریکی کڕین و فرۆشتن بووین و ژمارەی فۆڵۆوەرەکانی

پەیجەکەم حەفتا هەزاری تێپەڕاندبوو.

تەواو ناومان دەرکردبوو لەم کارەدا. ئیتر ئاسلان-ە دز نەمابوو و کاک ئاسلان-ی بەڕێز هەبوو. هەموو کەسێکی ئەو کەرتە باسی گەورەبوون و بەرەوپێشچوونی منی دەکرد و دەیانگوت: "لە ڕاستیدا ئەو هیچی نەکردبوو". زۆر ناچمە قوڵیی بابەتەکانەوە، ساڵانێکی ناخۆشبوون، نامەوێت بە باسکردنی ئەو ساڵانەی کە بە ئازارەوە گەورەیانکردم تۆش و خۆشم خەمبار بکەم. هەوڵدەدەم هەمووشتێک بە ڕوونی و کورتی باس بکەم. بەڵێ ئاسلان بێ ماندووبوون کاری دەکرد و دوای چەند مانگێک کارەکانی و دوکانەکەی لەگەڵ کاکە فواد-دا گەورەتر کرد و پەیجەکەشی گەورەتربوو. لەم نێوەندەدا ئاسلان کارێکی زۆر چاکی کرد. لەبەر ئەوەی هەمیشە لەسەر بەرنامەکە بوو ویستی ئایپاد بکڕێت و چوو ئایپادێکی کڕی، بەڵام ئەو بەرنامەیە لەسەر ئایپاد هێندە خۆش نەبوو. بۆیە هەژمارێکی نوێی بە ناوی (زانیاری) دانا و دەستیکرد بە ئادکردنی یەک دنیا کەس. بەڵام ئەو نەیدەزانی کە ئەم پەیجە دەبێتە هۆی گۆڕینی داهاتووی ئاسلان...

خودا لە ئایەتێکدا دەفەرموێت: "هیچ کەسێک ئەو مژدە و دڵخۆشییە نازانێت کە بۆی حەشاردراوە." سورەتێکی دیکەش دەفەرموێت: "دەکرێت ئێوە شتێکتان بەدڵنەبێت، بەڵام ئەوە خێرداره بۆتان. دیسان دەکرێت شتێکتان بەدڵبێت، بەڵام ئەوە خراپە بۆتان. خودا خۆی دەزانێت، ئێوە ناتوانن بزانن."

لە هەموو خێرێکدا شەڕێک و لە هەموو شەڕێکدا خێرێک هەیە.

ئایپادەکەم هێنا و سەیرمکرد بەکەڵکی هیچ ئیشێکم نایەت. شتی وا چۆن دەبێت؟ هەموو ئەو پارەیەی پێمبوو دام بەم ئایپادە تا پێویستییەکانم پڕ بکاتەوە، بەڵام زەڕەیەکیش پڕی نەکردنەوە. زۆر تورەبووم بەم ڕووداوە. ئایپادەکەم خستەلاوە، دوای هەفتەیەک ئینجا دامگیرساندەوە. کە دامگیرساندەوە هەژمارێکم دانا بە ناوی (زانیاری) بۆ چاودێریکردن و سەیرکردنی پەیجەکانیتر. دە پانزە وێنەم بڵاوکردەوە و لە ناکاو خەڵکی دەستیانکرد بە فۆڵۆوکردنی پەیجەکە. تێنەگەیشتم بۆ لە خۆیەوە دە پانزە کەس فۆڵۆویان دەنارد بە بەردەوامی. هەر شتێکم پۆست بکردایە ڕۆژ بە ڕۆژ و کاتژمێر بە کاتژمێر پەیجەکە بێوەستان گەورەتردەبوو. سەرەڕای ئەوەی هیچ ڕیکلامێکی بۆ نەکرابوو خەڵکی بەدڵیانبوو. لەو ماوەیەدا بەردەوامبووم لە فرۆشتنی بەرهەمەکان. لە لایەکەوە بە ئایپادەکە زانیاریم بڵاوکردەوە و لە لایەکی دیکەشەوە شتم دەفرۆشت لە ڕێگەی تەلەفۆنەکەمەوە. کارەکانی دوکانەکەش بە تەواوی کەوتبوونە سەر سکە. نزیکەی حەوت مانگبوو لە دوکانەکەبووم و هەموو بەرهەمە کۆنەکان فرۆشرابوون و هی تازەمان کڕیبوو، واتە ئێستا بە ڕێژەی لە سەدا پەنجا هاوبەشبووم لە هەموویاندا. دەمێکیشبوو ژمارەی فۆڵۆوەرەکانی پەیجەکەم نەوەد هەزاری تێپەڕاندبوو. ئیتر پارە دەهاتە دەستم و هەموو قەرزەکانم تەواوکردبوو و بە جوانی خزمەتی ماڵەکەمم دەکرد.

تاقیکردنەوەکانم هەرچەندە سەختیشبن،
دەزانم قەدەر سوپڕایزێکی هەر هەیە
لەبارەی دڵخۆشییەوە،
وە هەر دەمزانی
خودا لەگەڵمە...



کاتێک ئیشەکان کەوتنە سەر سکە هەستم بە شتێک کرد. من پەیجی زانیارییەکەم کردبووەوە و هەر بە بڵاوکردنەوەی زانیاری زیاتر لە چل هەزار فۆڵۆوەرم پەیداکردبوو. ئەمە ژمارەیەکی زۆر زۆربوو، چۆن بەبێ ڕیکلام و هەر لە خۆیەوە دەگات بە چل هەزار کەس؟ دانیشتم و بە وردی بەدواداچوونم کرد بۆ ئەمە. کاتێک سەیری نامەکانم کرد بینیم نزیکەی سەد نامەی داواکردنی ڕیکلامم بۆ هاتبوو. ئەگەر گرنگیم بەم پەیجە بدایە و ڕیکلامی پێویستم بۆ بکردایە ئەوا لە ماوەی دە پانزە ڕۆژێکدا چل هەزار فۆڵۆوەریتری بۆ دەهات. بۆیە قسەم لەگەڵ کاکە فواد کرد و پێمگوت دوو سێ هەفتە لەماڵەوە کار دەکەم.

دەستم دەکرد بە گرنگیدان بە پەیجەکەم و ئەویشم گەورە دەکرد و دەمکردە پەیجێکی فرۆشتن. دەمتوانی لە ماڵیشەوە بەردامبم لە شت فرۆشتن، بەڵام ئەو ماوەیە وازم لە گەڕان بە فەرمانگەکاندا هێنابوو. بەهۆی سەرقاڵییەوە نەمدەتوانی بڕۆم، تەنها بە تەلەفۆن گرنگیم بە کڕیارەکان دەدا، چونکە ئیتر داهاتمان پانزە هەزار لیرە نەبوو، بەڵکو تەنها لە ڕێگەی ئینتەرنێت و دوکانەکەوە مانگانە بیست و پێنج هەزار لیرە قازانجمان دەکرد، بێ ئەوەی پێویست بکات جانتایەک بکەمە شانم و بە فەرمانگەکاندا بگەڕێم و بیانفرۆشم، منیش و کاکە فواد-یش زۆر دڵخۆشبووین بەم دۆخە و هەرگیز نەماندەویست تێکبچێت.

ئەو هێزی دارایی خۆی بەکاردەهێنا بۆ بەرەوپێشبردنی

کارەکان و منیش چالاکی و زیرەکی خۆمم بەکاردەهێنا تا لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا زیاتر بناسرێین. ئەگەر ئەم پەیجەشم گەورە بکردایە دەمتوانی کارەکان بکەم بە دووهێندە. وە ڕۆژ بە ڕۆژ پەیجەکەم گەورەتر کرد و ڕیکلامم بۆ کرد... وامدەزانی ڕۆژی هەزار کەس زیاد دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمە پەیجێکی زانیارییبوو ڕۆژی پێنج هەزار فۆڵۆوەری بۆ دەهات، ئەمە شتێکی باوەڕپێنەکراوبوو! لە ماوەی دە ڕۆژدا ژمارەی فۆڵۆوەرەکانی پەیجەکەم گەیاندە سەد هەزار کەس، بەڵام لەو ماوەیەدا هەر بۆ هەوا هەڵمژینیش لە ماڵ نەدەچوومە دەرەوە. بەیانیان کاتژمێر نۆ هەڵدەستام لە خەو و تا پێنجی بەیانی دواتر خەریکی هەردوو پەیجەکە دەبووم. بۆ نمونە ئێستا بە چاوی کزەوە ئەمانەتان بۆ دەنووسم، گەورەترین زیانیشی هەر بۆ چاوەکانمبوو.

بەهەرحاڵ... ڕۆژ بە ڕۆژ بێ وەستان هەر خەریکیبووم. دوای پانزە ڕۆژ ژمارەی فۆڵۆوەرەکانی پەیجی زانیارییەکەم گەیشتبووە سەد و پەنجا هەزار کەس و ڕۆژانە لە خۆیەوە بێ ڕیکلام دوو هەزار کەس زیادی دەکرد. ئەمە کاریگەری لەسەر پەیجی فرۆشتنەکەشم هەبوو. ڕۆژانە پەیجی فرۆشتنەکەشم لەوێ بڵاودەکردەوە بەمەش ژمارەی فرۆشتنەکانم زیادی دەکرد. داهاتی مانگانەم لە بیست و پێنج هەزارەوە بەرزکردەوە بۆ سی هەزار لیرە، بەڵام ئەوە هەر هیچ نەبوو. ئیتر کە نامەی ڕیکلامم بۆ دەهات هەندێک پەیج دەیانگوت؛ "بە چەند ڕیکلام دەکەن؟" شۆک بووبووم! بە ڕیکلام پارە پەیدا دەکرێت؟ کەچی هیچ

خەرجییەکیشی نەبوو. دەفڕیم لە خۆشیدا دەمگوت؛ "ئەمە چییە بۆ خاتری خوا"، بەڵام یارمەتیدانی خەڵکی گرنگتربوو لەلای من. من کە دەستم بەم کارە کرد نامەم بۆ هەموو کەسێک نارد، کەسە باشەکان یارمەتیاندام و کەسەکانیتریش منیان بە کەم دەزانی و هەر وەڵامیشیان نەدەدامەوە. کاتێ خۆی داوای پارەیان لە منیش دەکرد و کە وایان دەگوت شێت دەبووم، بۆیە زۆر چاک لەو بارە دەروونییە تێدەگەم. بۆیە یارمەتی پەیجە بچووکەکانم دەدا و داوای پارەم لە پەیجە گەورەکان دەکرد. ڕۆژەکانم ئاوا تێدەپەڕین. ڕێک سی ڕۆژبوو لە ماڵ نەچووبووومە دەرەوە و کاکە فواد ناڕازیبوو و دەیگوت؛ "دە وەرە ئیتر". دەبوو بڕۆمە دەرەوە و خەریکی دوکانەکەشبم. لەو نێوەندەدا فۆڵۆوەری پەیجی زانیارییەکەشم دووسەد و پەنجا هەزار کەسی تێپەڕاندبوو و ڕۆژانە پارەم لێوەی پەیدا دەکرد. ئێستا دوو داهاتم هەبوو.

کە چووم بۆ دوکانەکە کاکە فواد دەموچاوی لێدابووم بەیەکدا، چونکە دەمێکبوو نەچووبووم بۆ دوکان، بەڵام دۆخەکەم بۆ ڕوونکردەوە. ئەو مانگە ئەرکی خۆمم بەجێهێنابوو، هەر لە ماڵەوە و واتە لە تەلەفۆنەوە بایی نۆ هەزار لیرە شتم فرۆشتبوو، بەڵام دۆخی فرۆشتنی دوکانەکە باش نەبوو. داهاتی مانگانەمان لە سی هەزار لیرەوە دابەزیبوو بۆ خوار بیست و پێنج هەزار لیرە و کاکە فواد هیچ لەم دۆخە ڕازی نەبوو، دەیگوت دەبێت خەریکی کارەکان بم. دەستم بە کار کرد و هیچ نەوەستام. ئێستا دوو دەرگای ڕزقم هەبوو و نەمدەتوانی ئەم نیعمەتانە لەدەست خۆم

بدەم. دەمویست کەمێک بەشی کاکە فواد-یش بدەم.

هەم باوکایەتی بۆ کردم هەم براگەورەیی... خودا لێی ڕازیبێت هەر کاتێک پێویستم بە هەرچییەکبووایە بەپێی توانای خۆی یارمەتی دەدام. ئەمڕۆ ئاوابوو و دەمزانی بەیانیش ئاوا دەبێت بۆم. تاکە کەس کە بتوانم لە بازرگانیدا متمانەی پێبکەم کاکە فواد بوو و دەمزانی ئەو هەموو کاتێک لەگەڵمدەبوو. هەر کاتێک پێویستم بە یارمەتی بوایە ئەو دەستی بۆ درێژ دەکردم. دوای ئەوەی ئەو هەموو زیانەی بەرکەوتووە و ئەو هەموو ناپاکییەی بەرامبەر کراوە بەڵام هێشتا متمانەی بە من دەکرد. کاکە فواد کەسێکی تایبەتبوو تایبەت...

ڕۆژ بە ڕۆژ دوکانەکەم گەورەتر کرد. پارەم لە پەیجی زانیارییەکەشەوە پەیدا دەکرد، بەڵام پارەیەکی زۆر نەبوو. کەسانی تر پێنج قاتی من پارەیان وەردەگرت بۆ ڕیکلام، بەڵام من کەمم وەردەگرت تا یارمەتی خەڵک بدەم، بەڵام داواکارییەکان زۆر بوون و جڵەوی کارەکەم لەدەستدابوو. دەمویست نرخەکە زیاد بکەم و پارەی زیاترم دەست بکەویت بەڵام دەترسام. جارێک لێکۆڵەرەکان هاتبوونە سەر سەرم و دەترسام دووبارە بێنەوە، بۆیە دەبوو پابەندی ڕێنماییەکان ببم و لێیان بکۆڵمەوە. ئەو کاتە ژمارەی فۆڵۆوەری پەیجی زانیارییەکە فرێبوو، چوار سەد هەزار کەسی تێپەڕاندبوو و ڕۆژانە بیست داواکاری ڕیکلامم بۆ دەهات، مەحاڵبوو فریای هەموویان بکەوم و تەرخانکردنی کات بۆ فرۆشگاکە زۆر قورسبوو.

منیش بە حسابی خۆم پلانم بۆ کارەکانم دانا. کاتەکانی ڕۆژم دابەشکرد و گوتم؛ "سی خولەک خەریکی پەیجی زانیارییەکە دەبم و سی خولەک خەریکی پەیجی فرۆشتنەکە دەبم." بەڵام باوەڕکە دۆستم هیچ کاتم بۆ خۆم تەرخان نەدەکرد. یانزە مانگی ڕەبەق تێپەڕی و یەک ڕۆژیش نەمگوت؛ "ئەمڕۆ پشوو دەدەم"، "دەچم بۆ بازاڕکردن"، "کەمێک دەخەوم"... بەیانی کاتژمێر نۆ و دە هەڵدەستام و شەوان کاتژمێر سێ و چوار دەخەوتم... ئاسڵان نەدەوەستا، هیچ نەدەوەستا...

لەو ماوەیەدا هاوڕێیەکی نزیکم کە لە فرۆشگا کۆنەکە دەمناسی، دەیویست ئۆتۆمبێلەکەی بفرۆشێت. پارەکەشی بۆ دەکردم بە قیست. منیش ئۆتۆمبێلەکەی خۆمم دەدایە و باقییەکەیم بە قیست پێدەدا. نرخی ئۆتۆمبێلەکەم ئەو کاتە نزیکەی بیست هەزار لیرەبوو و نرخی ئۆتۆمبێلی هاوڕێکەشم شەست هەزار لیرەبوو.

لەسەر کورسییەکی سارد دانیشتم و بیرمکردەوە، لەبەر خۆمەوە گوتم؛ "من کێم و خاوەن ئۆتۆمبێلی شەست هەزار لیرەیی کێیە؟ وای ئاسڵان وای! سوپاس بۆ خودا، سوپاس بۆخودا و ئافەرم بۆتۆ ئاسڵان کە خۆتت گرت و هیچ یاخی نەبوویت". لەگەڵ ئەو هاوڕێیەمدا ڕێککەوتم لەسەر ئۆتۆمبێلەکە و کاکە فواد-یش بوو بە کەفیلم و ئۆتۆمبێلەکەم کڕی. براکەم زۆر حەزی لە ئۆتۆمبێلبوو کە لە سەربازی گەڕایەوە زۆر سەری دەسوڕما. ماوەیەکیتر لە سەربازی دەگەڕایەوە و منیش تەنها قەرزی

ئۆتۆمبێلەکەم لەسەر مابوو. ئیتر پارەکانی پەیدام دەکرد پارەی من بوون و هیچ قەرزێکم لەسەر نەبوو. تەنها سی ڕۆژ جارێک قیستی ئۆتۆمبێلەکەمم دەدا و تەواو. با دووبارە بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان...

زۆر باش دەمزانی دەبێت بێ وەستان بەردەوامبم لە کارکردن. ئەمە باشترین سوودی ڕۆژە ناخۆشەکانم بوون، ئەگەر ناخۆشیم نەبینیایە بەهای خۆشیشم نەدەزانی، وە دڵنیابووم خودا لە هەموو کەسێک باشتر دەزانێت. کێ دەزانێت، لەوانەیە ئەو ڕۆژانەی گریان لە قورگمدا گیری دەخواردبوو و خۆم دەگرت و ناڕازی نەدەبووم، خودا خەریکی ئامادەکردنی ئەم ڕۆژە خۆشانەبووبێت بۆم، خۆشم تێنەگەیشتم چۆن کارەکانم گەورەبوون. لە مۆڵەکەشدا ناوبانگم دەرکردبوو. باسیان دەکردم و دەیانگوت؛ "ئەها ئەو کوڕەی لێرەبوو..." ڕۆژێک لە مۆڵەکە چوومە دەرەوە، بەرەو شەقامەکە ڕۆیشتم و چاوم بە هاوڕێیەکی نزیکی کۆنم کەوت؛ ناوی کاکە کازم بوو. لە ڕاستیدا هیچ ئارەزووم نەدەکرد چاوم پێی بکەوێت بەڵام ئەمە قەدەرە ئیتر و هیچم لەدەست نەدەهات.

کاکە کازم گوتی؛ "وای وای وای سەیری ئاسلان بکە ئاسلان!"

منیش بەڕێزەوە گوتم؛ "سڵاو کاکە، چۆنیت؟" کاکە کازم-یش گوتی؛ "کوڕم زۆر گۆڕاویت، پۆزاوی بوویت، جل و بەرگیشت گۆڕاوە. هەموو کەس باسی تۆ دەکات. کە پەیوەندیشت پێوە دەکەین هەر وەڵاممان نادەیتەوە... خێرە چی لە برایەتییەکەمان هاتووە؟" کە وای گوت ڕێک شێتبووم، چونکە کە من لەو

ڕۆژە سەختانەدابووم تەنها چاوەڕێی پەیوەندی چەند کەسێکی کەمم دەکرد و ئەویش یەکێک بوو لەو کەسانە، بەڵام کەسیان پەیوەندیان نەکرد چونکە ئیتر بە کەڵکیان نەدەهاتم.

کێ پەیوەندی بە ئاسلان-ی دزەوە دەکرد؟ پەیوەندیشی پێوە بکردایە چی بۆ دەکرد؟

بە کورتییەکەی پەیوەندیان پێوە نەکردم، کاکە کازم-یش پەیوەندی پێوە نەکردم، ئەویش و ئەمیش و ئەویش... بە ڕای من وەک کەسێکی گونجاو بۆ بەکارهێنان سەیری منیان دەکرد...

بەم شێوەیە وەڵامی ئەو قسەیەی کاکە کازم-م دایەوە:

"سەیرکە کاکە، بەخەیاڵمدا نایەت کێ باسی چی دەکات. ئەگەر بە خەیاڵمدا بهاتایە باوەڕکە نەدەگەیشتمە ئێستا، خۆمم دەکوشت بەهۆی ئەو لەکەیەی خرایە سەر ناوم، بەڵام با هەر لەبەر خاتری ڕۆژانی ڕابردوو وەڵامت بدەمەوە:

من نەگۆڕام، تەنها بیرۆکەی ئێوە لەبارەی منەوە گۆڕا. پێشتر وەک کەسێکی بچوک و گونجاو بۆ بەکارهێنان سەیری ئاسلان-تان دەکرد، بەڵام ئێستا وەک کەسێکی خاوەن کار و پارە و نازانمچی سەیری دەکەن، دوایش دێن و دەڵێن 'زۆر گۆڕاویت ئاسلان'. من نەگۆڕاوم. ئەگەر بەپێی پلە و پۆستیان سەیری مرۆڤەکان بکەن ئەوا هەموو کەسێک ڕۆژێک هەر دەگۆڕێت لەگەڵ ئێوە. دەی ماڵئاوا".

خۆزگە دەموچاویتان دەبینی کە وامگوت، بە جۆرێک سووربووبووەوە بووبوو بە تەماتە، بەڵام کاکە کازم سوعبەتی زۆر لێ دەهات...

زۆر پرسیارم لە دەوروبەرەکەم کرد کە ئاخۆ من گۆڕاوم؟ زۆربەیان دەیانگوت کە نەگۆڕاوم، بەڵام هەموو ڕۆژێک سەیری ئاوێنەم دەکرد و لە خۆم دەپرسی: "من گۆڕاوم؟" هەموو ڕۆژێک لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "ئەگەر کاتێک خودا پارەی بۆ ناردین، کارەکتەر و کەسایەتی و هۆکاری بوونمان گۆڕا ئەوا هەر نەینێرێت باشترە".

ئەگەر شتە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ لەبەر کاری دونیا بگۆڕێت ئەوا ئەو مرۆڤە هەر نەژی باشترە.

زیاتر لە ساڵێکبوو لە دوکانەکە کارم دەکرد و ژمارەی فۆڵۆوەری پەیجی فرۆشتنەکەشم سەد و دە هەزار کەسی تێپەڕاندبوو. داهاتی مانگانەمان لە سی هەزار لیرە کەمتر نەبوو. قازانجی باشمان دەکرد، تەنها بە کاری دوکانەکە پارەی ئۆتۆمبێلەکەم پێدەدرا. ژمارەی فۆڵۆوەری پەیجی زانیارییەکەشم گەیشتبووە نۆ سەد هەزار کەس و ڕۆژانە لەوێ چوار پێنج ڕیکلامم دەکرد بە نرخێکی باش، داهاتی ڕۆژانەی باشبوو. لە ڕاستیدا یەکێکیتر لە هۆکاری بوونم بە هاوبەشی دووکانەکە ئەوەبوو کە دەمتوانی وەسڵ بۆ کاری ڕیکلامەکان ببڕم و باجی

لێ بدەم. ئەمە بە هەموو شێوەیەک منی ئاسوودە دەکرد. کاکە فواد زۆر سەر بە خێربوو بۆ من، بێگومان لە سایەی خوداوەبوو، هەمیشە دەڵێم؛ "کەسێکی باشبووە بۆیە خودا هێناویتییە سەر ڕێم". هەمیشە جێی کاکە فواد-یش دەکەمەوە لە نزاکانمدا.

هەموو ئەو ئەزموونانەی
لە هەڵەکانی دوێنێمەوە فێردەبم،
ڕێگری لە هەڵەکانی ئەمڕۆم دەکەن.
هەموو هەڵەیەک ئامرازێکی شاهانەیە
بۆ فێربوونی وانە،
ئەوەی نەیزانێت لێی تێناگات.



## بە نزاکانم قەدەرم گۆڕابوو؟

قەرزەکانم تەواوبووبوون و دەمێکیشبوو دەستم کردبوو بە کۆکردنەوەی پارە. تەنها قیستی ئۆتۆمبێلەکەم دەدا، بەڵام وام لێهاتوو کە ئەگەر بمویستایە دەمتوانی بە چاوتروکانێک هەموو ئەو پارەیەش بدەم. ئیتر دەستم کردبوو بە پلاندانان بۆ داهاتووم، بەڵام نەمدەتوانی بە باشی ئەو پلانانە دابنێم، چونکە ڕاهاتبووم بە بێپارەیی و بە گوتنی؛ "پارەی جگەرەم پێبێت بەسە." پارەم بۆچی خەرج بکردایە؟ چ ئارەزوویەکم مابوو؟ خۆشیم لە هیچ نەدەبینی، ئەم ژیانە منی زۆر گۆڕیبوو. خەمی کاری دونیا و هەوەسی دونیایی نەبوو، خەمی شتی ترم بوو، شتی تر. هەوڵم دەدا ببمە مرۆڤ و خێزانەکەم بەخێو بکەم. تاکە مانای پارە لای من دابینکردنی بژێویم و نەهێشتنی کێشە بوو... دەمزانی بەبێ پارەش دەتوانم بژیم، هەناسە بدەم. بە نەبوونی پارە نەمردم و نەشدەکرا ڕێگە بدەم هەبوونی بمگۆڕێت، بەڵام شتێکم لەیادکردبوو: دایکم.

ئەو ژنە ساڵێکە بۆخۆی بەماڵی دراوسێکاندا دەگەڕێت، بەڵام کوڕەکەی لە سەربازیبوو و مێردەکەی بەجێیهێشتبوو، پێویستی بە گەشتێک و کەمێک هەوا هەڵمژین نەبوو؟ دەبوو وەک کوڕێکی باش بە یەکەم پارەم کە کۆمکردەوە ئەو بنێرم بۆ گەشتێکی خۆش، بۆ خۆشترین شوێن.

بیرم لێکردەوە، هێنام و بردم، دواتر پەیوەندیم بە خوشکەکەمەوە کرد. هەرگیز لەیادی ناکەم کاتێک گوتم؛ "دەمەوێت دایکم بنێرم بۆ عەمرە، گەشتێکی عەمرەم بۆ بدۆزەرەوە." خوشکەکەم بە پێکەنینەوە گوتی؛ "برا شێرەکەم!"دەمویست بە یەکەم پارەی کۆکراوەم دایکم بنێرم بۆ عەمرە و شانازیشم بەمەوە دەکرد، چونکە خودا منی کردبووە وەسیلەی شتی باش. لە جیاتی ئەوەی ئەو پارەیە تەخشان و پەخشان بکەم، منی ڕاسپاردبوو دایکم بنێرم بۆ عەمرە و ئەم هەستە هێندە جوانە پێناسە ناکرێت...

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ داهاتم زیاتر دەبوو. منیش زیاتر هەوڵمدەدا و نەمدەتوانی ئەم هەلەی هاتۆتە بەردەستم لەدەست بدەم و بۆ مەبەستی خراپ بەکاری بهێنم. دەبوو زیاتر سەرشێتی گەنجێتیم دابمرکێنمەوە. نەدەکرا هەرگیز زنجیرەکانی شل بکەمەوە، هەر دەبوو کەمێک توندتر بێت، کەمێک توندتر، کەمێک توندتر...

گەنج بووم و هێندە پارەم پەیدادەکرد کە پێشتر هەرگیز نەمبینیبوو و بەدەستم نەهێنابوو... گەنجێتییەکی خۆشم نەبوو، هێشتا نەفسم هەر هەوڵیدەدا بمخاتە داوی خۆیەوە، بەڵام نەدەبوو بمکەومە داوییەوە و بەهۆیەوە ناپاکی لە خۆم بکەم. ناچاربووم داهاتوویەکی باش بۆ خۆم و خێزانەکەم ئامادە بکەم. بۆیە نەمدەتوانی بۆخۆم بگەڕێم و خۆشی ببینم، یان هەر شتێکیتری گەنجێتی بکەم. لە هەموو خێزانێکدا کەسێک خۆی دەکات بە قوربانی، ئەو کەسەی خێزانی ئێمەش من بووم و خۆمم بەبەخت دەزانی بۆ ئەمە.

ژیانێکم هەبوو کەس لێپێچینەوەی لێ نەدەکردم. پارەی حەڵاڵم پەیدا دەکرد و کەس لێپێچینەوەی لێ نەدەکردم، نە دایکم و نە باوکم... دەمتوانی خۆم بژێنم و هەروەها خێزانەکەشم بژێنم. ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو دایکم بچێت بۆ عەمرە. زۆر دڵخۆشبووم. کاتێک سەیری هەڵفڕینی فڕۆکەکەم دەکرد چەندین باڵندەی جوانیش لە ناخی مندا هەڵدەفڕین و سەمایان دەکرد. هەستێکبوو مەحاڵە بتوانم پێناسەی بکەم، ئەو دڵخۆشییەی دایکم، دڵخۆشی خوشکەکەم، دڵخۆشی نەنک و باپیرم شایەنی هەموو ئەو ناخۆشیانەبوون کە چەشتبووم، یان کاتێک هاورێکانی دایکم دەهاتن و دەیانگوت؛ "تۆ شێریت شێر!"... لەو کاتانەدا یەک زەردەخەنەی بچووکیش بەسە بۆ ئاسوودەکردنی ناخی مرۆڤ. باشبوو دەنگی ئەو شەیتانە بچوکانەی ناخمم نەبیستبوو و گوێم لێنەگرتبوون، باشبوو...

پێش ئەوەی دایکم بڕوات وێنەیەکم لەگەڵدا گرت و پاشان دایکم چووە فڕۆکەکەوە و بە نزاوە ماڵئاواییم لێ کرد. وێنەکەمانم لە هەژماری کەسی خۆمدا بڵاوکردەوە. ئەم وێنەیە هەواڵبەری ڕووداوێکی خۆشبوو، ڕووداوێک کە ژیانم دەگۆڕێت...

هەرچەندە ژیانم گۆڕابوو، بەڵام هێشتا کەموکورتی هەبوو؛ خۆشەویستە جوانەکەم، عەشقی ئامادەیم... هەمیشە هۆش و بیرم هەر لەلای ئەو بوو، وەک ئەوەی بەشێکم لەلای ئەو جێمابێت. بە خۆمم دەگوت؛ "تۆ چیت بەسەرنەهات ئاسلان، بەسەر ئەو

هەموو شتەدا زاڵبوویت و چەندین دەریا و زەریات تێپەڕاند، بەڵام کە کەوچکێک ئاو دێتەوە یادت خەریکە خۆت دەخنکێنیت، چۆن دەتوانیت ئەمە بکەیت؟"

دەمتوانی، چونکە کە ئەو دەهاتەوە یادم وازم لە هەموو شتێک دەهێنا، لەو ساتەدا ژیان دەوەستا لەلام. پێکەنینەکانم دەڕۆیشتن و دەموچاوم مۆن دەبوو، فرمێسکەکانم یەک یەک دەڕژانە ناخمەوە. ئازاری عەشق هیچنەبوو لە چاو ئەو هەموو نەهامەتی و ئازارەی چەشتوومە، بەڵام هێشتا هەر بە ئازاربوو، ئازارێکبوو نە تێدەپەڕی و نە دادەمرکایەوە. ئیتر ئەمە دڵە، هەر دەسوتێت و دەسوتێت.

دایکم ڕۆیشت. منیش بەو دڵخۆشییەوە ڕۆژەکانم بەڕێدەکرد و زیاتر خەریکی کارەکانم بووم. بوێرییەکی بێمانام هەبوو و هەرچییەکم ببینیایە دەمگوت؛ "دەتوانم بیکەم" و خۆم هەڵدەدایە ناویەوە، لەبەر ئەوەی پێشتر لە سفرەوە سەرمایەیەکم پێکەوەنابوو نەدەترسام لە لەدەستدانی.

ڕۆژێک دوای ئەوەی دایکمم نارد بۆ عەمرە داواکارییەکی کارم بۆ هات، لەبارەی کردنەوەی دوکانی زیوەوە بوو لە مۆڵێکدا و منیش یەکسەر قبوڵمکرد. دەزانم دەڵێیت؛ "ئەو کەسە دەناسیت کە دەبێت بە هاوبەشی؟ بەباشی پرسیار و سۆراغی کارەکە و کەرتەکەت کردووە؟" ئەمانەم زۆر بیستووە، بەڵام هەر دەمزانی

ئەگەر سەریشبکەوم و ئیفلاسیش بکەم خودا هەر لەگەڵمە. خودا زۆر زیاتر لەوە دەزانێت کە من و تۆ دەیزانین. بە دڵێکی ئاسوودە و متمانە بە خوداوە دەچوومە ناو هەموو کارێکەوە و دەشمزانی ئەو کەسەی ڕزقم بۆ دەنێرێت و لێشم دەسێنێتەوە هەر خودایە. کە بۆی ناردم پێم نەگوتبوو؛ "خودا بۆچی ڕزقت بۆ من نارد؟" تاوەکو لێی سەندمەوە بتوانم بڵێم "خودایە بۆ لە منت سەندەوە؟"

**دەمگوت؛ "خودا گەورەیە و لەگەڵمە" و لە دەرگای ئاسوودەیم دەدا و هەموو جارێکیش...**

دەبوو لە ماوەیەکی کەمدا ئەو دوکانە بکەینەوە، براکەشم تازە سەربازی تەواوکردبوو و پێویستی بە کار بوو. ئەو پارەیەی لەو ماوە کورتەدا کۆمکردبوەوە بەشی ئەم کارەی دەکرد، بەڵام دەمانتوانی بە قیستیش بیدەین بۆیە ئەوەمان کرد بە قیست و منیش ئۆتۆمبێلەکەم دەگۆڕی بە ئۆتۆمبێلێکی بەرزتر، تاکە هۆکاری گۆڕینی ئۆتۆمبێلەکەم پاراستنی پارەکەی دەستمبوو. لەو کاتەدا نەمدەتوانی موڵکێک بکرم بۆیە بەردەوام ئۆتۆمبێلەکەم دەکرد بە یەکێکی بەرزتر و کە گەیشتە نرخێکی باش دەمفرۆشت و خانوێکم پێ دەکڕی.

بەهەرحاڵ... چوومە ناو ئەو کاری زیوەوە. دە ڕۆژمان لەبەردەستدابوو، دەبوو دوکان و ستاندەکان ئامادە بکەین. دەبوو هانی براکەشم بدەم بۆ ئەم کارە. براکەم لە من نەدەچوو، منیش لەو نەدەچووم. براکەم بەس بۆ ئەوە باشبوو ئەرکی پێ بدەیت. پێی بڵێی؛ "لێرەدا دیوارێک درووست بکە" و بڕۆ، لێتناپرسێت چۆن بیکەم، خێرا دەیکات. منیش دەتوانم بۆت باس بکەم کە چۆن ئەو دیوارە دەڕوخێت بەڵام هەرگیز ناتوانم بیڕوخێنم. کەسێکم ناتوانم دەرنەفیزێکیش بگرم. مێشکم زۆر باش کاردەکات، بەڵام هیچ دەستڕەنگین نیم. بەڵام براکەم ڕێک بە پێچەوانەی منەوەبوو...

بەباشی قسەم لەگەڵ براکەمدا کرد لەم بارەیەوە. هەندێک شتم پێگوت وەک؛ "ئەمە کار و داهاتووی ئێمەیە. ئەگەر کاری زیوەکە سەربگرێت ئەوا دوکانەکە دەبێت بە هی تۆ، دەتوانی لەسەر ئەو داهاتووی خۆت بونیاد بنێیت، بەڵام هەمیشە پرسیار بکە و ڕای من وەک برا گەورەت وەربگرە".

لە ماوەی دە ڕۆژدا هەموو شتێکمان تەواوکرد و دوکان و ستاندەکانمان کردەوە. ئەمە دەبوو بە سوپرایزێکی زۆر خۆش بۆ دایکم، چونکە ئیتر خەمی ئێمەی نەدەما. ئەو زۆر خەمی براکەمیبوو، چونکە هیچ کارێکی نەبوو. خودا بەهۆی نزاکانی دایکمەوە و لە ڕێگەی منەوە دەرگای لە براکەشم کردەوە. زۆر سوپاس بۆ خودا.

**هەرگیزاوهەرگیز مەترسە لە دۆڕان.**
**بزانە کە دەبێت بەرگەی دۆڕانیش بگریت**
**تا بتوانیت بیبەیتەوە.**

لەو ماوەیەدا ژمارەی فۆڵۆوەرەکانی پەیجی زانیارییەکەم گەیشتبووە ملیۆنێک و سەد هەزار کەس و کارەکانی پەیجی فرۆشتنەکەشم بێ کێشە دەڕۆیشتن. هەرچەندە کاری زیوەکە بەباشی نەدەڕۆیشت، بەڵام دەمتوانی بە پارەی خۆم ئەوێ لەسەر پێ بهێڵمەوە.

پێنج ڕۆژێک مابوو بۆ گەڕانەوەی دایکم. ئەها گوتم وێنەیەکی خۆمانم لە هەژماری کەسیمدا بڵاوکردەوە، ئەو وێنەیە دیارییەکی زۆر جوانی بۆ هێنام.

کۆمێنتێکم بینی کە دوو ڕۆژ پێشتر کرابوو و ئەو کۆمێنتە لەلایەن عەشقی ئامادەیم، ئەیلول-ەوە نووسرابوو.

دەزانیت چیم کرد؟ تەلەفۆنەکەم لێ کەوتە خوارەوە و شکا! کۆمێنتەکە نەما، نەمدەتوانی ببینم. بەپەلە بانگی براکەمم کرد و پێمگوت؛ "خێرا تەلەفۆنەکەتم بۆ بهێنە!" لێم وەرگرت و لە تەلەفۆنەکەی ئەوەوە چوومە ناو هەژماری کەسیمەوە؛ نازانم چۆن باسی ئەو ساتەتان بۆ بکەم. دڵم هێندە بە پەلە لێیدەدا خەریکبوو

لە سنگمەوە دەردەپەڕی. پێشتر دڵم لەسەر ئاوازی مەرگ لێیدەدا، بەڵام ئێستا لەگەڵ خۆشترین گۆرانیدا سەما دەکات...

ئەیلول، لە کۆمێنتەکەدا نووسیبووی؛ "خودا بەیەکتان شادبکاتەوە". نەمدەتوانی باوەڕ بکەم، فۆڵۆوی منی دەکرد؟ یەکسەر چووم سەیری پەیجەکانم کرد یەک یەک، نەخێر نەیدەکرد، بەڵام پێش دوو ڕۆژ ئادی بۆ پەیجی فرۆشتنەکەم ناردبوو و لەوێ بینیبووی. بە خۆمم دەگوت؛ "کوڕە ئاسڵان چۆن دوو ڕۆژە نەتبینیوە؟" و دەمکێشا بەخۆمدا. یەکسەر وەڵامی کۆمێنتەکەیم دایەوە. نزیکەی چل کۆمێنتی ترم بۆ هاتبوو و وەڵامی کەسیانم نەدابوەوە، بەڵام ئەیلول جیاوازبوو. ئەو جوانترین وەرزبوو، هەموو وەرزەکانم لەلای ئەو زیندانی کرابوون. ئەیلول-م زۆر جوان خۆشویستبوو، خۆشەویستیم بۆ ئەو زۆر جیاوازبوو. نەمدەزانی خۆشەویستیتر چییە، چونکە کەسم خۆشنەویست دوای ئەو، بەڵام خۆشەویستەکانی دەوروبەرمم دەبینی. ئەوەی من جیاوازبوو، نەمدەتوانی لەیادی بکەم. هەموو شتێک لە ناو قەدەرمدابوو و عاشقیش بەشێکبوو لە تاقیکردنەوەکەم.

سوپاسم کرد و نامەیەکی تایبەتم بۆ نارد و نووسیم؛ "چۆنیت؟" لەو ساتە بەدواوە وازم لە ئیش و کار هێنا، دەستم بەسەر تەلەفۆنی براکەمدا گرت و هەر بەدەستمەوەبوو و وەک ئاوارە دەسوڕامەوە، بەردەوام سەیری تەلەفۆنەکەم دەکرد و چاوەڕێی وەڵامی بووم. دەی ئاسڵان چاوەڕێبکە، ئارامبگرە، ئەنجامی ئارامگری خۆشییە. دەی ئەیلول دەی! شەش

کاتژمێر بەسەر ئەو نامەیەدا تێپەڕیبوو، هێشتا وەڵامی نەبوو. خۆرئاوابووبوو، نە نانم خواردبوو نە ئاوم خواردبووەوە؛ تەنها بەدەم چا و جگەرەوە سەیری تەلەفۆنەکەم دەکرد. براکەشم چووبوو تەلەفۆنێکی بۆ کڕیبووم. تەلەفۆنەکەیم پێدایەوە و ئەوەی خۆمم هەڵگرت. تەلەفۆنەکەیترم پارچە پارچە بووبوو، هەموو وێنە و زانیارییەکانی ناوی فەوتابوون، بەڵام بەخەیاڵی کێدا دێت؟ دنیا بڕوخایە بە خەیاڵمدا نەدەهات. پێنج ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو و بۆ یەک چرکەش خۆشەویستە جوانەکەمم لەیاد نەکردبوو. ئەیلول نامەی بۆ ناردبووم، ئەگەر چلەی زستانیشبوایە خۆر بۆ من هەڵدەهات! ئەیلول گەڵاکان زەرد دەکات و هەڵیاندەوەرێنێت و خەماوییە، بەڵام ڕێک بەپێچەوانەوەبوو بۆ من. بووبووە چەقی ژیانم و هەموو ژیانم وەستاندبوو چاوەڕێی وەڵامی ئەو بووم. کە چوومەوە بۆماڵەوە دەوروبەری کاتژمێر هەشت و نیو و ئەوانەبوو، بینیم نامەی ناردووە:

"باشم سوپاس. تۆ چۆنی؟"

بێ ئەوەی یەک چرکەشی بەسەردا تێبپەڕێت وەڵامم دایەوە. لەوانەیە سەری سوڕمابێت یان با بڵێم؛ ئێمەی کوڕ هێندەی کچەکان زۆرزان نین. دڵخۆشی و خۆشەویستی و هەموو هەستەکانمان لە کاتی خۆیدا دەژین، بەڵام کچان وانین ئەوان چاوەڕێ دەکەن. نامەکە دەبینن بەڵام چاوەڕێ دەکەن. دەڵێن؛ "چاوەڕێ بکات باشترە." ئەوان زۆر جیاوازن لە ئێمە. من یەکسەر وەڵامم دابوەوە، بەڵام دەمزانی دەبوو چاوەڕێی وەڵامی ئەو بکەم،

لە وەڵامدا نووسیم:

"منیش باشم. کە کۆمێنتەکەتم بینی زۆر سەرم سوڕما و دڵخۆشبووم."

وەک ئەوە نەبوو کە بیرم لێکردبوەوە و یەکسەر وەڵامیدایەوە؛

"منیش زۆر سەرم سوڕما کە پەیجی فرۆشتنەکەتم بینی. لەوێوە هەژمارە کەسییەکەتم بینی و سەیرمکرد دایکت چووە بۆ عەمرە، زۆر دڵم پێی خۆشبوو و ئەو کۆمێنتەم نووسی".

نازانم نامەکانی ساردبوو یان نا، بەڵام بۆ من ساردبوو، چونکە ئاسلان دەسووتا، دیسانەوە خۆی هەڵدابووە ناو ئاگرەوە.

ئەیلول ئاقڵبوو خۆی هەڵنەدەدایە ناو ئاگرەوە، بەڵام ئاسلان ئاوایە؟ ئاسلان بوێربوو بوێر...

بەردەوامبووین لە نامە ناردن، هەوڵم دەدا بابەتێک بکەمەوە بەس ئەیلول کەمێک ساردبوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەبوو چاوم پێی بکەوێت.

تا کاتژمێر دە و نیو بەردەوامبووین لە نامە ناردن، دواتر ئەیلول گوتی دەچێن نان بخوات دواتر نامە دەنێرێتەوە و ڕۆیشت، بەڵام من هەر بیرم نەبوو نان بخۆم. کە ئەیلول باسی نانخواردنی کرد زانیم چەند برسیمە... کەمێک شتم بەپەلە خوارد و چوومەوە ژوورەکەم، لەسەر جێگەکەم پاڵکەوتم، تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و سەیری هەژمارەکەی ئەیلولم کرد و یەک یەک لە وێنەکانی، کۆمێنتەکانی و لایکەکانی وردبوومەوە تا بزانم ئاخۆ کەس هەیە لە ژیانیدا؟ ئاخر وشەی "ئاخۆ" هێندە ئازاری دڵی

مرۆڤ دەدات؟ ترس هەموو لەشمی گرتبوەوە، ئەگەر وەڵامی ئەو "ئاخۆ"یە "بەڵێ"بوایە من دەمردم، خۆمم بە مردوو دەزانی و دووبارە دەڕوخامەوە. نازانم دەبوو هەر لە سەرەتاوە قسەی لەگەڵ نەکەم؟ لەوانەیە خودا دڵخۆشییەکی وەک پاداشتی ئەو هەموو دەرد و خەمەی بۆ دانابێتم و دەشیزانی ناتوانم بەبێ ئەیلول دڵخۆش ببم. هەموو دڵخۆشی من پەیوەستبوو بەوەوە.

نیوەشەوبوو کە نامەی ناردەوە. کاتێک لە ناو جێگە ساردەکەمدا چاوەڕێی نامەی ئەوم دەکرد نامەیەکی کورتی نارد و نووسیبووی:

"شەوشاد" و لە کۆتاییدا زەردەخەنەیەکی بچووکی دانابوو...

چەند کاتژمێر قسەم لەگەڵ ئەیلول کردبوو، بەڵام ئەمە یەکەم جاربوو زەردەخەنەیەک بکات. دڵم خێراتر لێیدەدا. نەمدەزانی ئاخۆ بەیانیش دەڵێت؛ "بەیانیت باش"، بەڵام دەبوو ئەم جارە من تاقی بکەمەوە. پێش ئەوەی خەوم لێ بکەوێت چوومە ناو دونیای خەیاڵمەوە، یەک یەک لە خەیاڵەکانم ووردبوومەوە. ڕاستە هەموویان جوانبوون، بەڵام خەیاڵەکانم لەگەڵ ئەیلول جیاوازبوون، زۆر شاهانەبوون. هەموو خەیاڵەکانم کەوتبوونە کۆتاییەوە و ئەو لە پێش هەموویانەوەبوو.

بەیانی هەر هەستام لە خەو ئەو نامەیەم نارد کە لە شەوەوە ئامادەمکردبوو: "بەیانیت باش گێژە گیان". "گێژە گیان" دەستەواژەیەکبوو کە لە ساڵانی ئامادەییدا بەرامبەر یەکتر بەکارمان دەهێنا زۆر خۆش و شیرینبوو لەلامان.

دەمزانی ئەویش بیری دێتەوە، بەڵام نەمدەزانی تورە دەبێت یان پێدەکەنێت. بەڵام من لەو نێوەندەدا وەک دەروێش دەمویست خۆم بدەم بە دار و بەرددا. نا نا پەشیمان بوومەوە، دەبم بە بەدەوی و لە بیابانێکدا خۆم دەدەم بەملا و بەولادا. دڵم خەریکبوو دەوەستا.

"بەیانی تۆش باش گێژە گیانم."

ئەویش نامەیەکی بۆ ناردم و پێی گوتبووم؛ "گێژە گیان"، هێندە حەزم دەکرد بگەڕێمەوە سالانی ئامادەییم... ئەگەر لە ژیانی ئاساییدا کەسێک پێم بڵیت؛ "گێژە گیان" چیم بە دەمدا بێت پێی دەڵیم، و هەرگیز وا بە کەس ناڵێم، بەڵام بیری هەموو شتێکی تایبەت بە ئەیلول-م دەکرد. هەموو ژیانم بۆ ئەو تەرخانکردبوو، کە لەیەکیش جیابوینەوە ژیانێک و خەیاڵی خۆشم لەلا بەجێهێشت و بە نیوەیی بەردەومبووم لە ژیان. ئێستاش دووبارە خەیاڵەکانم و ئەو ڕۆژە خۆشانەم دەویستەوە.

لەو ماوەیەدا کەمێک کارەکانم پشتگوێ خستبوو. دوکانی زیوەکە تازە کرابووەوە، بەڵام نەمدەتوانی بڕۆم و ئاگاداری بم، نەمدەویست لە ماڵیش بچمە دەر، بەڵام دەبوو بەردەوام بم لە ژیان. بیرتبێت ئەگەر من بکەوتمایە خێزانەکەشم دەکەوت... چووم بۆسەر کار و ماوە ماوە بەردەوامبووین لە نامە نارد. دەچووم بۆ هەر شوێنێک پێیان دەگوتم؛ "خێرە ئاسلان؟ وەک گوڵ گەشاویتەتەوە" بەڵام نەیاندەزانی خۆم وەک گوڵ گەشاومەتەوە و دڕکەکانیشی لە ناخمدایە. زۆر دڵخۆشبووم، بەڵام هێندەی

دڵخۆشییەکەم و ترس و دڵەڕاوکێشم هەبوو، بەڵام تەنها دڵخۆشیی بە ڕوخسارمەوە دیاربوو. ڕۆژانە کەمێک خەریکی ئیش و کار دەبووم و بە بەردەوامی نامەم بۆ ئەیلول دەنارد.

ئەوەندەی تێگەیشتبم، وابزانم ئەیلول زۆر خەمباربوو، ئەویان زۆر خەمبار کردبوو. لە هەموو نامەیەکیدا هەستم بە ناڕەزاییەک دەکرد و زۆر خەمم بۆ ئەم دۆخە دەخوارد. ئەو کچە جوانەیان خەمبار کردبوو کە من هێندەی گیانم خۆشمدەویست. ئەگەر منبوومایە هیچ خەمبارم دەکرد؟ هیچ دڵم دەهات؟ ئەم بیرۆکانە دەستیان بەسەر هەموو مێشکمدا گرتبوو. دەمویست دڵخۆش ببم لەگەڵ ئەو و هەنگاوێک بنێم بەرەو ئەو. ئەو کەسێکبوو شایەنی دڵخۆشی بوو چاوە جوانەکانی شایەنی بریسکانەوەبوون.

ئەیلول کەسێکی پاک و خۆشباوەڕبوو. هیچ خراپەیەک نازانێت، نیەتی باشە، کەمێک باڵای کورتە، ووردیلەیە، ئەسمەرە و کچێکی شیرینە. زۆر گرنگی بە جل و بەرگی دەدات و بە سەلیقەیە.

لە ساڵانی ئامادەییدا من کەسێکی سەرسەری بووم، ئەویش کچێکی نارین و ناسک بوو، بەڵام هێشتا کەسە سەرسەرییەکانی خۆشدەویست. خۆ سەرسەرێتی ئێمەش بەرامبەر خەڵکی نەبوو، بەڵکو بەرامبەر ژیان بوو، بەڵام ژیان منی گەورەکرد، پێیگەیاندم و سەوزی کردم. بەڵام لقە سەوزەکانم میوەیان پێوە نەبوو. دەمزانی کە ئەو میوانە لەگەڵ ئەیلول-دا پێدەگەن.

جیابوونەوم لەگەڵ ئەیلول ڕوداوێکی زۆر گەورەبوو، هەر تێنەگەیشتم کە چی بووبوو. خۆشەویستە چاو و برۆ جوانەکەم

لە ناکاو ڕۆیشت و بەجێیهێشتم و بۆ ماوەیەکی زۆر بەدوای هۆکاری ڕۆیشتنیدا گەڕام، کە دۆزیشمەوە هیچ لێی تێنەگەیشتم، بەهۆی هۆکاری خێزانییەوە ناچاربووبوو هەڵبژاردنێک بکات لە نێوان من و خێزانەکەیدا. بەڕای من ئەمە دەرگایەک بوو بۆ من. ئاخۆ ئەویش بیری لە من کردۆتەوە؟ ئەم هەموو ساڵە تێپەڕیوە، تۆبڵێی هیچ مەراقی کردبێت و بەدوامدا گەڕابێت؟

یەک دنیا پرسیار ناخمیان دەخوارد و لەناویان دەبردم...

هەرچییەکم کردووە دەبێت چاوم بەو بکەوێت. دوو ڕۆژی مابوو بۆ هاتنەوە دایکم. ئەو شەوە سێ کاتژمێر قسەم لەگەڵ ئەیلول کرد، کاتێک باسی ڕابردوو و ئێستامان دەکرد کەم کەم باسی ژیانیشمم بۆ کرد، گوتی کە زۆر سەرسام بووە و شانازیم پێوە دەکات. چەند شتێکی گوت لەسەر ئەوەی زۆر خەمباربووە بۆ دۆخی دایکم و باوکم، بەڵام لە کۆتاییدا هەموویان تێپەڕیون. چەندین ساڵە خەمبار و دەردەدارم؛ چەندین ڕستەی دڵدانەوەم بیستبوو، بەڵام هیچیان هێندەی ئەو دوو ڕستەیەی ئەیلول کاریگەرییان نەبوو لەسەرم. زۆر جیاوازبوو، ئارامی بۆ هێنام و چاکیکردبوومەوە.

بە ئەیلول-م گوت کە دوو ڕۆژیتر دایکم لە عەمرە دێتەوە، بەهانەیەکم هێنایەوە و گوتم؛ "دەمەوێت بازنێکی عەمرەت بە دیاری بۆ بهێنم. با یەک ببینین تا پێت بدەم." تەنها ئەمە بە مێشکمدا هات لەو کاتەدا. ئەویش ڕازیبوو و گوتی؛ "باشە". لەو ساتەدا هەموو دونیا وەک فەرشی سوور لەبەردەممدا ڕاخرا و

منیش تاکە کەسی سەر ئەو فەرشە سوورە بووم.

بە یەک "بەڵێ" هەموو دونیای لەبەردەممدا ڕاخستبوو. نازانم ئایا ئەم دڵخۆشییە زیاد لە پێویستبوو؟ شایەنی ئەو هەموو چاوەڕوانییەبوو؟ ئەی ئەگەر هەموو شتێک تێکبچێتەوە؟ نەشمدەزانی کە ئەوم بینی چی بکەم، بەڵام دەمویست بە توندی باوەشی پێدا بکەم و بۆنی بکەم. بۆنی گوڵەبەیبوونی لێ دەهات، ئەو بۆنە بە جۆرێکبوو کە کاتێک بۆنم دەکرد خۆشبوو و کاتێک بۆنم نەدەکرد هەستێکی بە ئازاربوو.

پەیوەندیم بە دایکمەوە کرد و خێرا داوای بازنێکی جوان و نازسکم لێ کرد. دایکیشم زۆر سەری سوڕمابوو، چونکە پێشتر هەرگیز نەیبیستبوو دیاری یان هەر شتێک بۆ کچێک بکڕم، هەرگیز نەیبینیبوو هێندە گرنگی بە کەس بدەم. دایکم گوتی؛ "بەسەرچاو کوڕم". ڕۆژی دواتر سێ چوار وێنەی بۆ ناردم و منیش یەکێکیانم هەڵبژارد. بازنێکی پیازیی مەرجانی جوان بوو کە لە بەردی تایبەت درووستکرابوو... تۆبڵێی چەند جوانبێت لە دەستە جوان و ناسکەکەی ئەیلول-ەکەمدا...

وا مەزانە لەو نێوەندەدا وازم لە کارەکانم هێناوە، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە کارم دەکرد. هەرچەندە بە جەستە ژیانم وەستابوو، بەڵام مێشکم هەر بەردەوامبوو لە کارکردن و پارەم کۆدەکردەوە بۆ کڕینی ئۆتۆمبێلێکی نوێ و لە هەمان کاتدا بەدوای ئۆتۆمبێلیشدا دەگەڕام. دەمێکبوو قەرزی ئۆتۆمبێلەکەی پێشوومم تەواوکردبوو وا یەکێکیتر بەڕێوەبوو. ئەم جارە ئۆتۆمبێلێکی باشم دەکڕی.

هەموو ئۆتۆمبێلەکانم باشبوون، بەڵام ئەمە کەمێک گرانبەهابوو، یەک تۆزی مابوو بە خەیاڵەکانم بگەم لەبارەی ئۆتۆمبێلەوە. من کێم و خاوەنی ئەو ئۆمبێلە کێیە، بەڵام ئیتر خودا کردی بە نسیبم. ئەگەر خودا بیەوێت ئەم ئۆتۆمبێلە، ماڵ و یەخت و هەموو شتێکم دەبێت...

دایکم هاتەوە و پێشوازیمان لێ کرد. دڵخۆشی بینینی ئەیلول بەسەر ئەم دڵخۆشییەشمدا زاڵ بووبوو. هێندە ئارەزووم دەکرد زوو ببێتە ڕۆژی دواتر، چاوم هیچی نەدەبینی. دایکمان هەڵگرت و هاتینەوە بۆ ماڵەوە، میوانمان هات، نان و خورما و ئاوی زەمزەم-مان بەخشییەوە... بە هیچ کاتم لێ نەدەڕۆیشت. بۆ بەیانی چاوم بە ئەیلول دەکەوت، ڕێککەوتبووم لەگەڵی و بەردەوام بازنەکەم بەدەستەوەبوو.

زۆر مەراقمبوو بزانم چی دەکەم کە ئەوم بینی. دوای پێنج ساڵ بۆ یەکەمین جار چاوم پێی دەکەوت. وێنەکان بەسنەبوون بۆم، یان دڵنیابە بەسنەبوو بزانم باشە. لە کاتێکدا کە ئەیلول-ەکەم باشیش نەبوو، دەمزانی دڵی شکاوە و بێتاقەتە ئەم ماوەیە. باشترکردنی ئەو ئەرکی سەر شانی من بوو.

"بۆ ئەیلول

دەکرێت هەموو شتێک بە کاغەزێکی سپی بکرێت
بۆ نمونە فڕۆکە، یان کۆلارە
یان دەکرێت بخرێتە ژێر قاچی مێزێکەوە
چونکە لەوەی تریان کورتترە.

دەکرێت شیعری لەسەر بنووسرێت، لەبارەی تەمەنێکەوە
که ماوەکەی لەوانەی تر کەمترە.
دەکرێت هەموو شتێک لەسەر کاغەزێکی سپی بنووسرێت
بێجگە لە تۆ
قورسە نموونەی جوانییەکەت بدۆزمەوە
لە هەمووی باشتر ئەوەیە پرسیار لە
گوڵێک، بەهارێک، پایزێک بکەیت
کە هەوڵ دەدەن لە تۆ بچن.
لەوانەیە چارەی ئەم بێچارەییەی من کە لە باخەوانێکی بێ هۆشی
گوڵێکی هێندە جوانی وەک تۆ دەچم لە سرووشتدا حەشاردرابێت.
کەمێک لە گژو گیا دەزانم، بەڵام ناتوانم باسی قسەکانی خۆر و خاکت
لەبارەی گوڵێکی جوانی وەک تۆوەت بۆ بکەم.
تۆ ڕووناکیم پێ بدە، بەسمە
من زوو چەکەرە دەکەم
ڕەگەکانم لە ناخمدا شاردۆتەوە
کەس نییە بێت سۆراغێکیان بکات
ئەگەر شیعرێکت دەوێت
کە لێکچواندنی تێدابێت
ئەوا ببورە خۆشەویستم

شتێک نییە هێندە جوانبێت کە لە تۆ بچێت!
ڕێبوارێکی بێ نان و تێشووم و لە ڕێیەکی دوورەوە هاتووم
بە خۆشەویستی ئازاربەخش و بێ ئازاردا تێپەڕیم
کاغەزێکی سپیم لە باوەشدایە
باسی هەموو شتێکم بۆ کرد
هەموو ڕووداوەکان، ئازار و ژانەکان
ئەگەر بمزانیایە بۆ گەیشتنە بە تۆ
ئەوا هەموو وچانی ژانەکان و هاوڕێیەتییە جێگیرەکانم خێراتر تێدەپەڕاند
بە ڕاکردن دەهاتم بۆلای
شینیی مەرجانی چاوەکانت.
سەیرکردنی تۆ
وەک سەیرکردنی ئاوە.
سەیرکردنی تۆ
تێگەیشتنە لە موعجیزەیەک.
ئەو ڕێیانە شایەتمن کە بێ سەیرکردنی لای چەپ پیایاندا تێپەڕیم.
لە لێکۆڵینەوەی عەشقدا، تەنها کەلەپچەکان تۆمەتبارن
هەرچییەک بنووسم سەرناگرێت
چونکە ئەوانەی دەیزانن بیریاندێتەوە،
فرۆشیاری گوڵی دەستکرد،
باخەوانەکان نین، بەڵکو بازرگانەکانن.

تۆ کە چاوێکی ئاوات هەیە،
تۆ کە هاوبەشی خۆر و خاکیت،
تۆ کە پێستێکی وەک بەهەشتت هەیە،
نووسینی شیعر لەبارەتەوە گەمژەییە.
تەنها یەک وشەم پێ دەمێنێت
پێت دەڵێم؛ "گوڵەکەم" و تەمەنی هەموو گوڵەکان درێژ دەبێت
با هەموو ئەو شتانەی پێم گوتوویت لەلای تۆ بێت
من پێت دەڵێم؛ "گوڵەکەم"، تا هەموو گوڵەکان نەمر بن، چونکە
لە تۆ دەچن
هەموو ئەو شیعرانەی بۆ تۆم نووسیوە تەنها پێشەکی کتێبێکن
سەیرکردنی تۆ،
وەک سەیرکردنی کاغەزێکی سپی وایە،
کە ئامادەیە ببێت بە هەموو شتێک.
سەیرکردنی تۆ وەک سەیرکردنی ئاوە
شەرم لەو ڕوخسارە دەکەیت کە دەیبینیت
سەیرکردنی تۆ
وەک ڕەتکردنەوەی هەموو ڕووداوەکان
و تێگەیشتن لە موعجیزەیەکە.
سەیرکردنی تۆ
باوەرهێنان بە خودایە."
-یلماز ئەردۆغان

پەڕەیەکی نوێ، ڕۆژێکی نوێ، ژیانێکی نوێ بوو و کاتی یەکتربینینەکە هاتبوو. وێنەمان بۆ یەکتر نارد و گوتمان؛ "لە ڕێگام، وا دێم ڕێگا قەرەباڵغە..." پێش ئەوەی لە ماڵ دەرچم سەد جار سەیری ئاوێنەکەم کردەوە، کە سەیرم کرد هەستم کرد خودا منی بۆ ئەم ساتە ئامادە کردووە. ئاسلان-ە کۆنەکە نەمابوو، ئاسلان بەهێزبووبوو، فێربووبوو لەسەر پێی خۆی بوەستێت. نەچووبوو بۆ زانکۆ، بەڵام دەرچووی زانکۆی ژیانبوو بەهۆی ئەزموونەکانییەوە. ئەیلول-یش بە کاتی سەختدا تێدەپەڕی و دڵی شکابوو. گەورەبووبوو و دەبوو ئیتر بیر لە ژیانێکی جددی بکاتەوە.

با بێینەوە سەر باسی ساتی چاوپێکەوتنەکە. لەو ساتەدا من نەمام نە... ئێستاش کە ئەمانە دەنووسم دەنگی قاقا لە دڵمەوە بەرزدەبێتەوە و زەردەخەنەیەک دەخاتە سەر ڕوخسارم.

کە ئەوم بینی نەمام، هەموو گیانم دەستی کرد بە ئارەقکردنەوە، دنیا ساردبوو، بەڵام من هەموو گیانم ئاوبوو. لەبەرچاومدا بوو و بەرەو من دەهات، بە زۆر خۆم گرت تا باوەشی پیادا نەکەم. تەوقەم لەگەڵ کرد و ماچی ڕوومەتەکانیم کرد و گوتم؛ "بەخێر هاتیت".

لەوکاتەدا ئەیلول وایدەزانی دەڵێم بەخێرهاتیت بۆ ئەوێ، بەڵام ئەو بەخێرهاتبوو بۆ ناو ژیانم. لەڕاستیدا ژیانمی بۆ هێنابوومەوە و پێینەزانیبوو.

ئەویش کەمێک دڵی خۆشبوو، بەڵام هەوڵیدەدا بیشارێتەوە. لە کافتریایەک یەکمانبینی. چووینە سووچێکەوە و داوای دوو قاوەمان کرد. کەمێک سەیری یەکتریمان کرد و دەستمانکرد بە گفتوگۆکردن. بەهۆی کارەکەمەوە ئایپاد و جانتایەکم پێبوو، کە بینی هێندە بچووکە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی؛ "تۆ جانتای ئاوات لە شان دەکرد؟" کەمێک تەعلیقی لە ڕابردوومدا، دۆستم ناتوانم بەباشی باسی ئەو ساتانەت بۆ بکەم، پێناسەکردنیان مەحاڵە... وەک ئەوەی لە غوربەتدابم چاوەڕێی ئەم ساتانە و ئەو نامانە و ئەو قسانە بووم، بەردەوام هەوڵم دەدا دووبارە ببینەوە بە خۆشەویست، بەڵام ئەیلول هەمیشە خۆی بە دوور دەگرت. بەردەوام ئەو بابەتەم دەکردەوە و سەرم دەخستە سەری.

قاوەکانمان هات، گارسۆن لەسەر مێزەکە دایانان. ئەیلول دیسان کاری خۆی کرد... دەستنەسرەوتییەکی هێندە شیرینی هەبوو نازانم چۆن باسی بکەم، ئەوەندە پاک و بێتاوانبوو مرۆڤ نەیدەتوانی لێشی تووڕە بێت. هەر کە قاوەکەی هات یەکسەر ڕشتی بەخۆیدا، ئێمەش سەیرێکی یەکترمان کرد و دەستمان کرد بە قاقا لێدان.

بە پێکەنینەوە گوتم؛ "ئەرێ دیسان، دیسان؟" ئەویش بە خەمبارییەوە گوتی؛ "دە ئاسلان سەر مەخەرە سەرم، وەڵاهی بە ئەنقەست نییە". خەمباربوونی بۆ بابەتێکی ئاواش منی لەناودەبرد.

یەکسەر بابەتەکەم کردەوە. ئاسلان-ە بوێرەکە دیسان کاری خۆی کرد.

گوتم؛ "ئەیلول، دەزانم بەردەوام خۆت بە دووردەگریت، دڵیشت شکاوە، ئەوەشیان دەزانم، بەڵام تەنها لەبەر یەک ئامانج هاتووم بۆ بینینت. بەڕوونی قسەت لەگەڵ دەکەم." و ئەیلول بە سەرسوڕمانەوە گوتی؛

"ئامانجت پێدانی بازنەکە نەبوو؟ دەزانم، بەڵام هەر وەک گوتم من پەیوەندی یان شتێکیترم ناوێت. تازە زانکۆم تەواوکردووە و ماستەر دەخوێنم و دواتریش کار دەکەم." و بەردەوام هەر هەمان شتی دەگوتەوە.

منیش بە توندی دەستم کێشا بە مێزەکەدا و ڕێک گوتم :

"سەیرکە، جوان سەیری ئەم مێزە بکە... ئا لێرەدا دەنووسم، بێشەرەفم ئەگەر تۆ نەهێنم و هاوسەرگیریت لەگەڵ نەکەم، تۆش دەیبینی".

ئەیلول-یش گوتی؛ "ئاسڵان قسەی بێمانا مەکە. سەیرکە، کە ئاوا قسە دەکەیت زیاتر من لە خۆت دووردەخەیتەوە. بە هیچ جۆرێک بیر لە هیچ شتێک ناکەمەوە لەگەڵ کەسدا و هەرگیزیش بیری لێ ناکەمەوە، تێبگە لەمە. نامەوێت هاوڕێیەتی و قسەمان نەمێنێت و ناشمەوێت تۆ خەمبار بکەم".

منیش دووبارەم کردەوە:

"سەیرکە و ببینە، دوایی نەڵێیت نەیگوتبوو؛ تۆ هەر دەهێنم. هەرچییەکم کردبێت هەر دەتهێنم." کە وامگوت دەستی کرد بە توڕەبوون و هەمیشە کە تووڕەدەبوو بێدەنگ دەبوو و ئەوکاتەش بێدەنگ بوو.

کەمێک سەیری یەکمان کرد، بەڵام من لەو کاتەدا بە پەنجەم شتێکم لەسەر مێزەکە دەنووسی، دەمنووسی: "تۆ دەهێنم". کە ئەوەی بینی کەمێک نەرمبووەوە و منیش بازنەکەم لە گیرفانم دەرهێنا و گوتم: "دەستت بێنە ئەیلول" و بازنەکەم کردە دەستی. کاتێک دەمکردە دەستی گوتم: "ئەمڕۆ بازنم کردە دەستت، لە ماوەیەکی کەمدا ئەڵقەش دەکەمە پەنجەت، دەیبینیت." کە وامگوت شێتبوو.

لە ناکاو هاواری کرد و گوتی: "ئاسڵان بەسە!" بەڵام یەکسەر خۆی خۆی وەستاند و گوتی: "ببورە هاوارم کرد" بەڵام گرنگ نەبوو. هەرچەندیش هاواری بکردایە کێشە نەبوو. تازە ئەیلول-ەکەمم دۆزیبووەوە، هیچ دەمهێشت لەدەستم بچێت؟

بۆ ماوەی چەندین ساڵ خەیاڵی ئەیلول بە ژوورەکەمدا دەهات و دەچوو و ئێستاش لەبەرامبەرمدا بوو.

گفتوگۆی زۆرمان کرد و وردە وردە بە گەرمی قسەی لەگەڵ دەکردم، بەڵام من هەر نەدەوەستام و لە بەینی هەموو قسەیەکدا دەمگوت: "تۆ هەر دەهێنم". ئەویشت ئیتر بە گاڵتەوە وەڵامی ئەمەی دەدایەوە و وەک توتی هەر دەیگوت: "هەرگیزاو هەرگیز، نە لەگەڵ تۆ نە لەگەڵ کەسیتردا ئەمە ڕوونادات"، بەڵام نەیدەزانی منیش توتیبووم. هەر بەدەم گوتنی: "تۆ دەهێنم، تۆ دەهێنم"ەوە دوو سێ کاتژمێر گفتوگۆمان کرد، کاتی ماڵئاوایی هاتبوو، بەڵام من دەمێکبوو چاوپێکەوتنی داهاتووم ڕێکخستبوو. پێشمگوت: "کە گەیشتیتەوە ماڵەوە ئاگادارم بکەرەوە".

گوتی؛ "ئاسلان تۆ شێتیت؟ سەیرکە، پەشیمانم مەکەرەوە لەوەی هاتووم بۆ بینینت. بۆچی ئاگادارت بکەمەوە؟" بەلام زۆر سەری سوڕما لە وەلامەکەم.

گوتم؛ "ئەوە بزانە کە ئەگەر ئەمڕۆش ئاگادارم نەکەیتەوە بەیانی هەر ئاگادارم دەکەیتەوە، من جارێکیتر تۆ لەدەست نادەم، بۆیە خۆت لەسەر ئەمە ڕابهێنە و کە گەیشتیەوە ماڵەوە پێم بڵێ". و بردمە ناو ئۆتۆمبێلەکەیەوە.

نیوەکەی ترمم خستبووە ناو ئۆتۆمبێلەکەیەوە و بەرێمکردبوو...

لەمڕۆ بەدواوە هەرگیز چاوپۆشیم لێ نەدەکرد و بەردەوام سەرم دەخستە سەری. هەموو شتێکم دەکرد تا دووبارە بیکەمەوە بە خۆشەویستی خۆم، ئیتر هەرچۆنێک بێت، ماڵێکم لەگەڵ ئەودا پێکدەهێنا و دەبوو ئەمە بخەمە مێشکی ئەویشەوە.

ئۆتۆمبێلێکم لە پێشانگایەک دۆزیبوەوە، لەوێوە دەچووم بۆ پێشانگاکە تا سەیری بکەم. پەیوەندیم بە کاکە سەرهات-ەوە کرد و لە پێشانگاکە لەگەڵ ئەودا یەکمان دەبینی، پێشانگاکە نزیکبوو لەو کافتریایەوەی لێی دانیشتبووین. کە گەیشتمەوە پێشانگاکە نامەیەک لە ئەیلول-ەوە هات، نووسیبووی:

"گەیشتمە ماڵەوە."

ئەمە هەنگاوێکی زۆر باشبوو. ئەو هەموو قسەیەی پێ گوتم بەلام هەر هەنگاوێکینا، دەمزانی ئەویش دەیەوێت. دەشمزانی دەتوانم ئەو دڵشکاوی و خەمبارییەی بسڕمەوە و نەیهێڵم.

منیش سوپاسم کرد و وەلامێکی جوانی نامەکەیم دایەوە.

ئاگادارمکردەوە و پێمگوت؛ "منیش لە پێشانگای ئۆتۆمبێلەکەم"، بەم شێوەیە دەستمان کرد بە ئاگادارکردنەوەی یەکتر لە کارەکانمان. ناومان خۆشەویست نەبوو، بەڵام هەڵسوکەوتەکانمان بەرەو ئەوێ دەڕۆیشت.

دۆستم با شتێکت پێ بڵێم؛ "دەبێت بە خۆشەویستم؟" و ئەمانە شتی بێ بەهان. کاتێک دوو مرۆڤ بە ڕۆح و جەستە بەیەکەوە هەنگاو دەنێن، جا ناوی هەرچییەک بێت، عەشق دەمێکە لە دڵیاندا چەسپاوە و ئاوی ڕەنگەکانی ئەو چنارە گەورەیەی داوە.

کە پێمگوت لە پێشانگای ئۆتۆمبێلم و ئۆتۆمبێلەکەم دەگۆڕم سەری سوڕما و گوتی؛ "وێنەم بۆ بنێرە تا منیش ڕای خۆم بڵێم". بەم شێوەیە گفتوگۆمان بەردەوامبوو. لەو ماوەیەدا سەیری ئۆتۆمبێلەکەمان کرد لەگەڵ کاکە سەرهات-دا و تاقیمان کردەوە و بڕیارماندا بیکڕین. و کاتێک قسەم لەگەڵ کەسەکەی خەیاڵم دەکرد، دایکم لە ماڵە گەرمەکانمدایە و براکەم خاوەنی کاری خۆیەتی سەر ئۆتۆمبێلی خەیاڵەکانم دەکەوتم. لە ناو کۆمەڵێک هەستی جیاوازدابووم.

ڕێککەوتین و ئۆتۆمبێلەکەمان کڕی. ئەو ئۆتۆمبێلە هەموو داهاتی منبوو و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاترم پەیدا دەکرد.

خودا لەپڕ هەموو کارەکانمی لە ماوەیەکی کەمی وەک یەک ساڵدا و بە سەرمایەی پارەی تەلەفۆنێک خستبووە سەر سککە.

زۆر سەرت نایەشێنم بە وردەکارییەکانەوە، بەڵام زانکۆی

ژیانم تەواوکردبوو و لە تەمەنێکی گەنجدا خاوەنی ئەزموونی ژیانی زۆر باشبووم.

بەردەوامبووم لە قسەکردن لەگەڵ ئەیلول. هەفتەیەک تێپەڕی و ڕۆژێکیان لە نامەیەکدا پێمگوت؛ "عەشقم". لە وەڵامدا گوتی؛ "ئەرێ عەشقمی چی؟" بەڵام شەو و ڕۆژ نامەمان بۆیەک دەنارد، شەو و ڕۆژ هەواڵی منی دەپرسی و هەواڵی خۆی پێدەدام. منیش ڕێک بە ڕەقی پێمگوت؛ "بەیانی دەبێت بە عەشقم، لە ئێستاوە ببە و هیلاکم مەکە. تازە گەڕانەوە لەم ڕێگەیە نییە، من دەمەوێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەم، دەمەوێت ببیت بە خۆشەویستم و پێتناڵێم 'دەبێت بە خۆشەویستم؟' چونکە تۆ لە ئامادەییەوە خۆشەویستی منیت. تۆم لەدەستدا و دواتر دۆزیمیتەوە، ئیتر وازت لێ ناهێنم، درێژەی پێمەدە".

بە پێکەنینەوە وەڵامیدایەوە.

ئیتر ئەو عەشقەکەی من بوو.

بە تێپەڕبوونی کات کارەکانم تەواو باشبوون و لەو نێوەندەشدا لەگەڵ ئەیلول-دا بووبووین بە جوتێکی بێهاوتا. خێزانەکەم، کارەکانم و ئەیلول؛ هەموو شتێک لەسەر سککەی خۆی بوو.

چوار مانگ تێپەڕیبوو، هێشتا لەگەڵ ئەیلول بووم. هەرچەندە جارجار شەڕمان دەکرد، بەڵام هەموو شتێک باشبوو.

هەنگاوم بەرەو هاوسەرگیری دەنا و ئەویشت هەستی بەمە کردبوو، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو داوای هاوسەرگیری لێ بکەم. لەگەڵ پوورزاکەیدا هەموو شتێکم ڕێکخست و لەگەڵ هاوڕێکانیدا

داواکارییەکی زۆر جوانم بۆ ئامادەکرد.

له لایەکی تریشەوە پەیجی زانیارییەکەم ملیۆنێک و حەوت سەد هەزار کەسی تێپەڕاندبوو، پەیجی فرۆشتنەکەشم وەکو خۆی بەردەوامبوو. کارەکان بەباشی دەڕۆیشتن، بەڵام کاری زیوەکە باشنەبوو و دەمویست دایبخەم، چونکە بەردەوام لە گیرفانی خۆم پارەم بۆ خەرج دەکرد.

واز له بازرگانی بێنە دۆستم با بێمەوە سەر عاشق.

داواکردنی هاوسەرگیری لە ماڵی ترسناک...

ماڵێکی ترسناکم ڕێکخست و هەرچی هاوڕێمان هەبوو بانگهێشتم کرد. کە دەچووینە ناو ماڵە ترسناکەکەوە وەک ئاهەنگێکی گەورە هەموو کەس جلی خوێنمژی لەبەردەکرد، کێک و کامێرەم ئامادە کردبوو و لەوێ چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد.

لە پێشدا من دەچوومە ژوورەوە و لە حەوشەکەدا دەکەوتمە سەر ئەژنۆ.

ماڵە ترسناکەکە ڤێلایەکبوو. باخچەی ڤێلاکەم زۆر جوان ئامادە کردبوو؛ هەموو کەس جلی خوێنمژی لەبەرکردبوو و هەموویان ماسک بە دەموچاویانەوەبوو، کوڕەکان لە ماسکەکەی منیان بە دەموچاوەوەبوو و کچەکانیش لە ماسکەکەی ئەیلول-یان بە دەموچاوەوەبوو و بە دەنگی بەرز مۆسیقاکەی ئێمەیان لێدەدا، بەڵام هەتا لە ماڵە ترسناکەکە نەچیتە دەرەوە نەتدەتوانی بیبیستیت. ڕێک لە سەر دیواری بەرامبەر ڤێلاکەش کارتێکم هەڵواسیبوو و لەسەری نووسیبووم:

"بێگومان ئەو بەهەشتەی ناو پێکەنینەکانت دەبێت بە ماڵم. ئایا دەبێت بە ماڵی من؟"

وە ئەو ساتە هات... چوومە دەرەوە و بە ڕاکردن ئەڵقەکەم دەرهێنا و کەوتمە سەر ئەژنۆ. هەموان دەستیان کرد بە هاوارکردن و تەقاندنی زینە. مۆم لەسەر زەوییەکەبوو، دڵ و باڵۆن و هەموو شتێکی لێبوو. من لەبەردەم کارتەکەدا کەوتمە سەر ئەژنۆ و کە ئەیلول هاتە دەرەوە زۆر سەریسوڕما، دەستی گرت بە دەمییەوە و بە ڕاکردن چووەوە ژوورەوە. کەس لە هیچ تێنەگەیشت، بەڵام هاوڕێکانی لە پشتەوە پاڵیان پێوەنا و کردیانەوە دەرەوە. لە دڵخۆشیدا نەیدەزانی چی بکات. منیش بە ڕاکردن ڕۆیشتم بەرەو دەرگاکە و دەستیم گرت و تا بەردەم کارتەکە ڕامکێشا و لەوێدا کەوتمەوە سەر ئەژنۆ. بە گریانەوە گوتم؛ "دەبێت بە ماڵم؟" ئەویشت هاواری کرد و گوتی؛ "بەڵێ، بەڵێ!" و قبوڵی کرد. ئەو کەسەی پێش چوار مانگ بە هیچ جۆرێک ڕازی نەبوو پەیوەندیشی لەگەڵمدا هەبێت ئێستا داوای هاوسەرگیرییەکەمی قبوڵکردووە.

ئیتر پێکەنینەکانی هی من بوون، هی من! چەندین ساڵ چاوەڕێی ئەمەم کرد، داوام کرد و نزام بۆی کرد.

لەگەڵ ئەیلول بەرەو هاوسەرگیری دەڕۆیشتین. بێ ئەوەی زۆر باسی وردەکارییەکان بکەم دەمەوێت بچمە سەر کۆتایی چیرۆکەکەم.

ڕۆژێک لەگەڵ ئەیلول-دا دانیشتین و باسی ڕۆژە کۆنەکانمان

کرد و هەرچی لە دڵماندابوو هەڵمانڕشت. ئەویشت وەک من بۆ ماوەی چەندین ساڵ بەدوامدا گەڕاوە، سەیری کردووم و چاوێکی هەر لەسەر من بووە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا. هەموو پرسیارەکانی مێشکمم لێ پرسی و وەڵامی هەموویانم وەرگرت. تێگەیشتم کە چاوەڕوانیکردن و ئارامگرتن لە عەشقدا شتێکی زۆر مەنتقی نییە. ئەگەر من پێشتر هەنگاوم بنایە و وەک ئێستا سووربوومایە لەوانەبوو ئێستا منداڵیشمان هەبوایە. نازانم، بێگومان ئاواش خێرێکی هەر تێدایە، بەڵام چاوەڕوانیکردن، ئارامگرتن، بێدەنگبوون بێ ئەوەی هیچ بکەیت، لە کەسی عاشق ناوەشێتەوە. تەنها ئەوەندەت پێ دەڵێم، بڕۆ و بەو کەسەی خۆشتدەوێت بڵێ کە خۆشتدەوێت و چاوەڕێ مەکە. هەندێک کات دواکەوتن بەم شێوەیە بە جوانی کۆتایی نایەت، بێ ئەوەی هیچ هەستێک بزانێت و باسی هیچ هەستێکت بکەیت چەندین ساڵ تێدەپەڕێت، دەکرێت ژیان لەگەڵ کەسیتردا پێکەوە بنێت و تۆش بە نیوەیی بمێنیتەوە. ئەگەر من ئێستا هەنگام بۆ نەنایە و دوای نەکەوتمایە ئەوا هاتا بە درێژایی تەمەنم بە نیوەیی دەمامەوە، دڵنیام لەمە، چونکە ئێستا هەست دەکەم تەواوبووم. سوپاسی ئەیلول دەکەم کە لایە کەمەکەمی دووبارە هێنایەوە بۆلام، بۆ ناو ڕۆحم و ناو دڵم...

## ڕوخسارت ئەستێرەیەک نەبوو لە ئاسماندا، بەڵکو هەموو ئاسمانبوو، هەمووی...

ڕۆژەکانی ئاسلان زۆر بە خۆشی تێدەپەڕین و کار و ژیانی خستبووە سەر سککەی خۆی، بە عاشقە لەدەستچووەکەی شادبووبوەوە و بەرەو هاوسەرگیری هەنگاویان دەنا. ئیش و کاریشی هێندە باشبوو بتوانێت هاوسەرگیری بکات بەبێ ئەوەی ببێتە ئەرک بۆسەر خێزانەکەی، خۆی دەیتوانی ئاهەنگەکەی ساز بکات. دەیتوانی هەموو شتێک بکڕێت بێ ئەوەی منەتی کەس هەڵبگریت.

ئەیلول-یش زانکۆی تەواوکردبوو، کەسایەتییە جوانەکەی جوانتر بووبوو، ژنێکی پاک، دڵباش و بەڕێزبوو، کەسێکبوو کە هەموو کوڕێک دەیویست هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات. کاتێک بیر لە ڕابردووم و داهاتووم دەکەمەوە پێموایە شایەنی ئەیلول-م. دەمویست ڕۆژە ناخۆشەکانم بفرۆشم لەبەرامبەر ڕۆژی خۆشدا، دەمویست بیانگۆڕمەوە. هەموو کاتێک ئارەزووی ئەوەم کردووە، بەڵام ڕۆژەکانم لەگەڵ ئەیلول زۆر جیاوازبوون، زۆر تایبەتبوون. بە کورتییەکەی هەموو شتێک جوانبوو.

گەیشتینە قۆناغی ناسینی خێزانەکان، هەستێکی زۆر خۆشبوو، خودا بە نسیبی هەموو کەسێکی بکات، خێزانی خۆشەویستەکەی بناسێت، هەنگاو بنێت بەرەو داهاتووی. خۆشی درووستکردنی

ژیان و هەموو شتێکی زۆر جیاوازبوو، لە هیچ هەستێکی دیکە ناچێت. خێزانەکانیشمان بەیەکناساندبوو ئیتر سەرەی قۆناغی خوازبێنیکردن بوو. ناتوانم باسی ئەو ڕۆژەت بۆ بکەم دۆستم، ئەو ڕۆژە زۆر تایبەت بوو زۆر، هەر فڕیم و ڕۆیشتم ئەو ڕۆژە...

ئەها قاوە تاڵەکە، ئەو قاوە تاڵەشم بیر نایەتەوە، با هەر ئەوەندە بڵێم و خۆت تێبگە... تاکە شت کە دێتەوە بیرم ئەوەبوو کە چوومە ناو ئەوماڵەوە هەموو گیانم بوو بە ئاو هێندە ئارەقم کردەوە بەهۆی سترێس، خۆشی، عاشق و ماشقەوە... هیچ ترسم نەبوو و وا خەریکبوو لایەنە کەمەکەمم تەواودەکرد. هەرگیز ڕێگەم پێنەدەدا وەک تۆپەڵێک بەفر لە دەستمدا بتوێتەوە و بڕوات، ئەو ئیتر هی من بوو، وا دەبوو بە هاوسەرم.

باپیرم داوای ئەیلول-ی کرد. دوای خوازبێنی نیشانەمان کرد، لەوێ ئەڵقەکانمان لەدەستکرد، نزا کرا، وێنە گیرا، مۆسیقا لێدرا، سەما کرا و پێکەنین و دڵخۆشبووین. هەرکەسە هەستێکی جیاوازی هەبوو؛ دایکەکان خۆشییەکی تێکەڵ بە خەمیان هەبوو، باوکەکان دڵخۆشییەکی تێکەڵ بە دڵەڕاوکیان هەبوو، خزمەکانمان دڵخۆشبوون و خوشک و براکانمان دەترسان... گەیشتن بە خۆشەویستەکەم، زانینی ئەوەی کە ئێستا خێزانەکەشی دەزانێت ئەو هی منە هەستێکی زۆر جیاوازە دۆستم، زۆر...

دوای نیشانەکە ئەگەر کەسێک کاتی بوەستاندایە لەو کاتەدا دەوەستام و لەو کاتەدا دەمامەوە. خۆشی گەڕان بەدوای ماڵدا، سەیریکردنی کەلوپەلی ناو ماڵ کە دەبوو ئێمە بڕیار لەسەر

ڕەنگەکەشی بدەین، گەڕان بەدوای هۆڵی ئاهەنگدا، جلی بووک، جلی زاوا، هەموو شتێک زۆر جوان و تایبەت بوو. ئێستا زۆر باشتر دەمزانی لە چیم کەمبووە و ئەو شتەی هەمیشە بە ئاواتییەوەبووم ئێستا لە جێی خۆیدابوو، بەڵام زۆر دەترسام. دەمزانی ئەگەر ئەمجارە لەدەستی بدەمەوە هەموو شتێک لەدەست دەدەم. ئەم دڵخۆشییانە جیاوازبوون، هیچ جێگرەوەیەکیان نییە، هیچ دڵخۆشییەک ڕکابەری ئەم دڵخۆشییانەی پێ ناکرێت. لەگەڵ ئەیلول هەموو شتێکمان کرد. خانوەکەمان بە کرێ گرت، کەلوپەلەکانمان ڕێکخست، هۆڵی ئاهەنگمان گرت... هەرچییەک بە مێشتکدا دێت لەبارەی هاوسەرگیرییەوە بەیەکەوە قۆڵمان کرد بە قۆڵی یەکتردا و کردمان.

سوپاس بۆ خودا، نەبووم بە ئەرک بۆ هیچ کەسێک، نە ماددی نە مەعنەوی. خودا لەگەڵمدابوو و وەک ئەوەی منی بۆ ئەم ڕۆژە ئامادە کردبێت. دەمێکبوو خودای بەخشندە داهاتەکەمی بەپێی ئەمە ڕێکخستبوو...

ڕۆژی ئاهەنگەکە هات. لە نەریتی ئێمەدا هێنانەدەرەوەی کچ لە ماڵی باوکی هەیە، لەوانەیە نەتبیستبێت. بە ڕێوڕەسمێکی جوانەوە ڕۆیشتم بۆ ماڵیان. لەگەڵ تیمی هەڵپەڕکێ و هەموو خزم و کەسەکانمدا ڕۆیشتین بۆ هێنانی خۆشەویستەکەم. هەموو ئەو کەسانەی کاتی خۆی لەلام نەبوون ئێستا لەلامبوون. دەبوو بچینە ماڵیان، دەستیان ماچ بکەین و کچەکە بهێنین، بەڵام لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا، لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا ئەمە زۆر قورسبوو. بۆ

کوڕەکە قورس نییە، بەڵام کە دەبینیت چەند قورسە بۆ کچەکە هەر لە خۆتەوە خەمبار دەبیت، بەڵام کاتێک قۆڵ دەکەیت بە قۆڵی خۆشەویستەکەتدا و وەک هاوسەرت لەو ماڵە دەیبەیتە دەرەوە هەموو شتێک تەواودەبێت.

بۆ منیش ئاوابوو. کاتێک چوومە ژوورەوە و بینیم هەموویان دەگرین و خەمبارن منیش خەمباربووم، بەڵام کاتێک کاکە سەرهات قۆڵمی گرت و گوتی؛ "خێرا کچەکە ببە و بڕۆرە دەرەوە." هەستم کرد چاوەکانم پڕ بوون. دەستیانم ماچ کرد و ئەیلول-م هێنا و چووینە دەرەوە لە ماڵ. کە چووینە دەرەوە بە بێدەنگی فرمێسک لە چاوەکانی ئەیلول دەهاتە خوارەوە، کە ئەوەم بینی توندتر دەستیم گرت و گوتم؛ "من لەلاتم". بردم و خستمە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، ئەگەر بپرسن بڵێن کاتێک ئەیلول دەگریا تۆ چیت دەکرد، من بە هەموو هێزی خۆم هاوارم دەکرد و دەمگوت؛ "کچێ تۆم هێنا، تۆم هێنا!" و لەوێشەوە چووین بۆ ئەو ئوتێلەی ئاهەنگەکەمانی لێ سازدەکرا و هەتا ئەوێ هاوارم دەکرد و دەمگوت؛ "تۆم هێنا!" ئەیلول-یش دەستیکرد بە پێکەنین و گوتی؛ "ئاسلان تۆ شێتبوویت؟"...

گەیشتینە ئوتێلەکە، هەتا خۆمان ئامادەکرد کاتی ئاهەنگەکە هات. کاکە سەرهات هات بۆلام و گوتی؛ "کوڕە ئاسلان، دەزانیت ئاهەنگی هاوسەرگیری چییە؟ شتێکە کوڕەکان دەڵێن 'خۆزگە چرکەیەک زووتر تەواودەبوو و دەڕۆیشتینەوە' و کچەکانیش دەڵێن؛ 'خۆزگە ئەم خەوە هەرگیز تەواونەدەبوو'. تۆ یەکێک مەبە

لەو کوڕانە. تۆ خاوەنی ئاهەنگەکەیت، ئەگەر تۆ خۆشی ببینیت ئەوا هەموو کەسێک خۆشی دەبینێت. ئەیلول هەتا دەمرێت ئەم خەوەی لە یاد ناچێت. تەواونەکردنی ئەو خەوەش لە دەستی تۆدایە، بۆیە بەپێی ئەوە بجوڵێرەوە".

ئاسلان کاتێک گوێی لەم قسانەبوو ئیتر بە ئاسودەیی دادەنیشت؟ نەخێر دەبوو ئەو ئاهەنگە ببێت بە خەو، خەو! ئاهەنگەکە دەستپێکرد، بەڵام کەس نەیدەویست تەواوببێت. دەهۆڵەکەم کردە شانم و هەموو میوانەکانم هەڵساندە سەر ستەیجەکە. بە درێژایی چەندین کاتژمێر هیچ دانەنیشتم و لەگەڵ ئەیلول-دا دەمانگوت؛ 'با ئەم خەوە هەرگیز تەواونەبێت'. هیچ نەمانگوت؛ "دەی با بڕۆین"، ئاهەنگەکە سێ چوار کاتژمێری خایاند و ئێمە هیچ دانەنیشتین. ئەو ساتانە ساتی بێ وێنە و شاهانەبوون. ئاهەنگەکەشمان تەواوبوو و ئیتر ڕێگەی ماڵەوەمان گرت. بە هۆڕن و گۆرانییەوە ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەکەمان و لەگەڵ ئەیلول-دا پێمان خستە ناو ئەو ماڵەوە تا تەمەنێک بەیەکەوە تیایدا بژین.

هاوسەرگیریم کرد دۆستم، هاوسەرگیریم کرد!

نازانم چۆن باسی بکەم، ئەگەر کەسێکم پێشتر بیگوتایە؛ "سەیرکە ئاسلان ئاوا و ئاوا دەبێت" دەمگوت؛ "مەحاڵە" و پێدەکەنیم پێی. ئەوە ڕوووینەدا، کەس نەهات و وام پێ بڵێت، بەڵام خۆشم بیرم لە دڵخۆشی ئاوا نەکردبوەوە و ئەو دڵخۆشییە دووبارە لە دەرگامیدابوو، تەنانەت خۆم بە زۆر ئەو دەرگایەم کردبوەوە، چونکە کاتێک ئەیلول-م بینییەوە بەڵێنم بەخۆمدا کە

هەرگیز جارێکیتر وازی لێ ناهێنم و هەموو شتێکم کرد تا دڵی بەدەستبهێنم و بەدەستیشمهێنا و ئەو بڕیاریدا ببێتە هاوسەرم و بووە هاوسەرم. زۆر سەیرە ئەو هەموو خەم و دەردە بەم خۆشییە کۆتایی پێبێت... نەمدەتوانی خەیاڵی ژیانێکی ئاوا بکەم... خودا بە دەستی خۆی منی پاڵنابوو بەرەو ئەم ئاسودەییە. زۆر سوپاس بۆ خودا کە گوێی لە نزاکانم گرتبوو و وەڵامیدابوومەوە.

قەرزاری یەک کەسیش نەبووم. ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەمم سازکرد،ماڵەکەمم ڕێکخست، زۆربەی خواستەکانی ئەیلول-م جێبەجێ کرد... هەرچەندە ئەیلول-ەکەم داوای هیچی نەکرد، بەڵام هەموو کاتێک دەمگوت؛ "دایکم چەشتی نابێت ئەیلول بیچێژێت" و بەوشێوەیە هەڵسوکەوتم کرد.

من ئاسلان-م. کەسێکبووم کە ژیانی بە باشی نەدەڕۆیشت. زۆر گەنجبووم و خاوەنی ڕۆحێکی بێهێزبووم کاتێک هەوڵم دەدا فێرببم چۆن شەڕ لەگەڵ ئازارەکاندا بکەم. بە گەنجی بوومە خاوەنی ئەزموون لەبارەی ژیانەوە و شەڕم لەگەڵ ژیان کرد. لەو کاتەشدا کە پێم وابوو قەدەرم هیچ باشنییە، نارەزایم دەرنەبڕی، دەمزانی لەسەروو قەدەریشەوە قەدەرهەیە و خودا نووسەری قەدەرە و خودا هەموو شتێک لە هەموو کەسێک باشتر دەزانێت. ئازاری هەموو کەسێک بە ئازارە بۆخۆی، منیش ئازاری زۆرم چەشت. هێندە خۆمم خواردبوەوە تووشی نەخۆشی دەروونی بووبووم. نەمدەزانی من کەسێکی باشم یان نا، بەڵام دەمزانی ئەو پارەیەی پەیدایدەکەم بۆ شتی باش خەرجی دەکەم. هەوڵمدا

یارمەتی هەموو کەسانی دەوروبەرم بدەم، چونکە دەمزانی خودا لە پاداشتی ئەمەدا زیاتری پێ دەبەخشیم، منیش دەمتوانی زیاتر یارمەتی خەڵک بدەم. هەمیشە نزام دەکرد و دەمگوت: "خودایە ئەم بەندەیەت بکە بە وەسیلەی یارمەتییەکانت".

من ئەو دەستە نەبووم کە دەیبەخشی، من تەنها وەسیلەیەکبووم. وەسیلەبوون هەستێکی شاهانە بوو. کاتێک سەیری ئاوێنەم دەکرد بە خۆمم دەگوت: "ئاسڵان تۆ شێریت، شێر" و خۆمم دڵخۆش دەکرد. بە کورتییەکەی، هەر چییەک ببێت، هەر چییەکت کرد بۆ چاکە بیکە. کاتێک لە ناو چاکەدا چەکەرە دەکەیت ڕەگ دادەکوتیت و دەبیتە دارێکی گەورە باوەڕم پێبکە دۆستم، هێزی کەس بەشی هەڵکەندنی ئەو دارە چنارە ناکات.

کێ دەیگوت ڕۆژێک دێت و ئاسڵان ئاوا چەکەرە دەکات، دەبێتە گورگێک کە خۆی کاری خۆی مەیسەر دەکات و پشتی قایم دەبێت؟ من وام نەدەگوت، بەڕای من هیچ کام لە ناسیاوەکانیشم وایان نەدەگوت. ژیان ڕێگەی بەمە نەدەدا.

ئێستا کەسێکی خێزانداربووم و هێلانەیەکی زۆر جوانم هەبوو. کارەکانم وەک خۆیان بەردەوامبوون، قەرزاری هیچ کەسێک نەبووم. بەردەوامبووم لە بەخێوکردنی خێزانەکەم، سوپاس بۆ خودا خێزانەکەشم زۆر باشە؛ دایکم، براکەم، خوشکەکەم و هەموویان. دەزانیت ئەیلول منی لەگەڵ باوکمدا ئاشتکردەوە؟ هەموو لایە شکاوەکانمی چاککردەوە. باوک وشەیەکی کەمبوو لەلای من و زۆربەی کات بە مردووم دادەنا و دڵم ڕەقبووبوو

بەرامبەری. ئەو ئەم بیرکردنەوانەمی نەهێشت و نێوانی من و باوکمی باشکرد. واتە لە ڕووی باوکیشمەوە لایەنە کەمەکەمی تەواوکردبوو و هەموو دەردەکانمی لەگەڵ خۆیدا بردبوو.

پەیجی زانیارییەکەم بەردەوامبوو، ژمارەی فۆڵۆوەرەکانم گەیشتبووە دوو ملیۆن و سەد هەزار کەس.

پەیجی فرۆشتنەکەشم بەردەوامبوو، بەڵام ئیتر من گرنگیم بەو پەیجە نەدەدا، ئەها برایەکم هەبوو کارم لەگەڵ دەکرد، ئەوەی لە زستاندا پوتی بۆ کڕیم، هاتەوە یادت؟ کاکە سەرهات-م... ئێستا لەگەڵ ئەودا هاوبەشبووین و ئەو گرنگی بە پەیجەکە دەدا. ئەو گرنگی بە پەیجەکە و دوکانەکەش دەدا لەگەڵ کاکە فواد. دوکانی زیوەکەشم فرۆشت. ئێستا لەگەڵ براکەمدا خەریکین لقی ڕێستۆرانتێکی زۆر گەورە دەکەینەوە و کاتێک ئەمە دەکەم قەرزاری هیچ کەسێک نابم.

هێشتا ئۆتۆمبێلی خۆمم هەیە. کاتێک باسی ئەمانەت بۆ دەکەم یان کاتێک دەیانخوێنیتەوە بە هەڵە لێم تێمەگە دۆستم، هەرگیز مەبەستم خۆ بە زلزانی و شانازیکردن نییە بە خۆمەوە. خودا دەینێرێت و هەر خوداش دەیباتەوە. بەڵام من ئەمانەم هەمووی بە فرۆشتنی تەلەفۆنێک پەیدا کرد، لە ڕاستیدا نەمدەتوانی بیکەم، بەڵام خودا ڕێگەی بۆ کردمەوە، منیش بەو ڕێگەیەدا ڕۆیشتم. دێمە سەر ئەوەی نزاکانم چیبوون و لە کوێدا گیرابوون، بۆیە تا ئەوێ بێ باسکردنی وردەکارییەکان بە خێرایی باسی بابەتەکان دەکەم.

ئیستا ڕێک سێ ساڵە دەستم بەو کارە کردووە. دەڵێم؛ "چەند زوو سێ ساڵ تێپەڕی". ئەو خۆشییانە، دووبارە دەستکردنەوە بە ژیان، ئەو دڵخۆشییە... هەر کاتێک دەردێکم ببینیایە وەک ئەو منداڵانەی خۆیان لە دەرزی دەشارنەوە منیش خۆمم دەشاردەوە، بەڵام ئێستا کاتێک ئاوڕ دەدەمەوە و سەیر دەکەم تێدەگەم کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵبووم و بردوومەتەوە. سێ ساڵ، سێ ساڵە من بەسەر ئەو دەردانەدا زاڵبووم. تووشی دەردیتر نەبووم؟ بێگومان توشیبووم، بەڵام کاتێک بیر لەوە دەکەینەوە کە قورسترین دەردم بینیوە، دەتوانم دوای هەموو دەردێک پێی بڵێم؛ "زۆر ئاسانیت"، من توانیم بیڵێم و تۆش دەتوانیت. خودا ئەوەندە دەردمان بداتێ کە بتوانین وای پێ بڵێین.

ساتە خۆشەکان هەر لە دوورەوە سەیرت دەکەن، بەڵام ڕۆژە ناخۆشەکان هەمیشە لەبەردەرگان، هەمیشە ئامادەن تا کە ڕۆژی خۆی هات پێش هەموو کەسێک چنگیان توند بکەن لەو قاچە جوان و ناسکانەی قەدەر. کاتێک دەشیخات ئەوا ئیتر هەرگیز ناوەستێت، شەقێکت تێهەڵدەدات و دەڕوات. هێزی ئەوەشت تیا ناهێڵێت دوای بکەویت...

جوانی چاکە لە خراپەدا،
جوانی سپیش لە ڕەشدا شاردراوەتەوە.
هەتا خراپە نەبێت لە چاکە تێناگەیت،
و هەتا ڕەش نەبێت لە سپی تێناگەیت.



لەبەر ئەوەی هاوسەرگیریم کردبوو ئێستا پسولەی نوێ بە ناومەوە دەرکرابوو. پارەی یەکێکیان نەدرابوو و کارەبای ماڵەکەی من و ئەیلول-یان بڕیبوو. ئەیلول پەیوەندی پێوە کردم و گوتی کارەباکەمانیان بڕیوە، منیش پێمگوت وێنەیەکی پسولەکە بگرێت و بۆم بنێرێت. بەڵام هەموو پسولەکانی دوکانەکە، ماڵی دایکم، تەلەفۆنەکانی براکەم، ماڵەکەی خۆمان و هەر پسولەیەکیتر کە بە مێشکتدا دێت هەمووی بە ئۆتۆماتیکی لە هەژمارە بانقییەکەم دەبڕدرا و ئەو کاتە پێمزانی کە دوو ساڵبوو من هەر سەیری پسولەکانیشم نەکردبوو. لە سەرەتاوە بۆم باسکربووی، ئەها ڕۆژێک لە دووکانی هاوڕێکەم دانیشتبووم، هاوڕێکەم قاوەی بۆ تێکردم و منیش پسولەکانم بەدەستەوەبوو و سەیرم دەکردن، گوتم: "خودایە هێندە پارەم پێبدە کە هەرگیز بیر لەم پسولانە نەکەمەوە". هاتەوە یادت؟

لەو کاتەدا قەدەری من گۆڕابوو و دوای سێ ساڵ من لەمە تێگەیشتم. من سێ ساڵبوو سەیری هیچ پسولەیەکم نەکردبوو و نەمگوتبوو: "ئادەی بزانم چەندە؟"

گوێبگرە دۆستم، گوێبگرە.

با باسی سورەتی فیلت بۆ بکەم.

ئەو سورەتەی باسی بەزاندنی فیل دەکات لەلایەن باڵندەی بچووک بچووکەوە.

هەر کاتێک لەم ژیانەدا خۆتت وەک ئەو باڵندانە بە بچووک و بێ بەرگری زانی ئەم سوڕەتە بهێنەرەوە یادت.

لەلای ئێمە گەورە یان بەهێزەکان نایبەنەوە،

بەڵکو ئەوە دەیباتەوە کە خودا لەگەڵییەتی!

لەلای ئێمە شتی مەحاڵ نییە،

کن فیکون هەیە!

چونکە خودا فەرمان دەکات و دەڵێت؛ "ببە" و دەبێت.

لەلای ئێمە باڵندەکان فیلەکان دەبەزێنن.

دەمەوێت بڵێم؛ هەرچییەک بێت دەبێت خۆت بۆ دۆڕانیش ئامادە بکەیت ئەگەر دەتەوێت بیبەیتەوە. هەرچییەک بێت دەبێت باوەڕی تەواوت بە خودا هەبێت و پاک بیت. دەتوانی شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ ژیاندا بکەیت، بەڵام هەرگیز ناتوانی قەدەری سەرو قەدەر ببەزێنیت، تەنها دەتوانیت بیگۆڕیت. لە ڕێگەی نزاوە دەتوانیت قسە لەگەڵ خودا بکەیت و ڕازی دڵی خۆتی بۆ باس بکەیت. خودا ناخی تۆ دەزانێت و دەزانێت چیت لە دڵدایە، بەڵام هەموو جارێک هەر دەیەوێت گوێی لێت بێت. ئەگەر هەموو جارێک بە پاکی و ئاسوودەیی بمێنیتەوە بەرامبەر خودا و ناڕەزایی دەرنەبڕیت و خۆت بگریت، بێگومان پاداشتی خۆت وەردەگریت.

من دەزانم پاداشتەکەی چییە، دەزانم. ئەی کە پاداشتەکەت وەرگرت چی دەکەیت؟ خۆی ئەمە گرنگە.

وا دەزانیت کە دەرد و خەمەکانت تەواوبوون تاقیکردنەوەکەشت تەواوبووە؟

نەخێر، ئێستا تاقیکردنەوە ئەسڵییەکەت دەستپێدەکات.

دەبێت بە خاوەنی ئەو هێزەی پێشتر نەتبووە. باشە ئەی چۆن ئەمە بەکاردەهێنیت؟

بۆ چاکەی بەکاردەهێنیت یان بۆ خراپە؟

بۆ حەرام یان حەڵاڵ؟

تاقیکردنەوە هەرگیز تەواو نابێت، تەنها دەگۆڕێت.

هەر وەک گوتم ئەگەر دڵت بە پاکی بهێڵیتەوە ئەوا هەموو تاقیکردنەوەیەک بە سەرکەوتوویی تێدەپەڕێنیت. ئەگەر گەیشتوویتەتە ئەو ئاستە لە تاقیکردنەوەکەتدا ئەوا سەیرێکی خۆت بکە بزانە خۆت، هێز و دەستت لە چیدا بەکاردەهێنیت؟

لە چاکەدا یان خراپەدا؟

لە حەرامدا یان حەڵاڵدا؟

بیری لێ بکەرەوە دۆستم، بیری لێ بکەرەوە. لە ساتی تەواوبوونی تاقیکردنەوەیەکدا بیر لە تاقیکردنەوە نوێکەت بکەرەوە...

لەبیری مەکە، ژیان هەموو جارێک تاقیکردنەوەیەکت دەهێنێتە پێش. نازانم هەموو جارێک ئاوا بە ئاسانی تێیدەپەڕێنم یان نا، بەڵام دەزانم تاقیکردنەوەکانم بەردەوامن و بەپێی ئەوە هەڵسوکەوت دەکەم. بەندەی بێ گوناح هەیە؟ بێگومان نییە، بەڵام بەندەی تەوبە نەکەر هەیە. من تەوبە دەکەم و بەردەوام دەبم. ئەی تۆ دۆستم؟

واز لە نزاکردن مەهێنە. بزانە کە خودا وەڵامی هەموو نزایەک دەداتەوە.

ئەگەر لە کاتی گیرابوون و گیرانەبوونیشیدا سوپاسی خودا بکەیت و متمانەی پێ بکەیت ئەوا باشترینی هەموو شتێک دەبێت بە هی تۆ. لە ڕووداوە خراپەکاندا بزانە خودا تۆ لە خراپەیەکیتر دەپارێزێت.

ئەگەر تاقیکردنەوەی نەبوونی تێبپەڕێنیت بە ئاسانی تاقیکردنەوەی هەبوویی تێدەپەڕێنیت، ئەوەندە بەسە کە لە کاتی نەبوونیدا ئارامبگریت و متمانە بە خودا بکەیت.

ئیتر ئاوهایە... ژیان و قەدەر ئاوایە. تاکە شت کە لە دەستمان دێت نزاکردنە...

بە خودات دەسپێرم...

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description



🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

Queen city

شاری شاژن

شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf

بۆ خوێنەران

چەناڵ

https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچوون و پسیار بۆ کتێب مەینیرە↓

@tanyahaji22

ئەکاونت↓

خالیکی وەرچەرخان هەیە لە قەدەری مرۆڤدا، ڕێک ئەو کاتەی دەیەوێت یاخی ببێت، بەڵێ بەڵێ ڕێک لەو کاتەدا، بە نزایەکی بچوک دەتوانیت بەو هێزە نەبینراوەی ناو دەستەکانت ڕێچکەی قەدەرت بگۆڕیت. چۆن دوای هەموو شەوێک ڕۆژ هەڵدێت ئاواش هەموو دەردێک کۆتایی پێدێت. دوای کەوتن دەبێت هەستیتەوە سەرپێ و خۆت بتەکێنیت و بەردەوامبیت لە ڕاکردن...

وە لە بیری مەکە، خودا لەگەڵتە و لەلاتە...

ئەگەر خودا لە ناو دڵتدا بێت، ئەوا لەم ژیانەدا پێویستت بە هیچ کەسێک نییە. هەرگیز لە بیری نەکەیت، لە ناو هەموو شەڕێکدا خێرێکی گەورە هەیە. ئەم دێڕەی حەزرەتی مەولانا چەند خۆشە:

**حەددم چییە بڵێم باش نیم؟**

**لە هەموو دۆخێکدا هەر سوپاس بۆ خودا.**




کتێبخانەی **گۆڵدن بووک**

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

07701598762 - 07501444434





5000